پەیامەکانی
گەنجان
19

# تیشکێك بۆسەر
# قەزاو قەدەر

ئیکرام کەریم









پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان

تیشکێک بۆسەر

# قەزاو قەدەر

نووسینی:

ئیکرام کەریم



## زنجیرە کتێبەکانی گۆڤاری ڕێنوێن


- ناوی کتێب: تیشکێك بۆسەر قەزاو قەدەر
- نوسینی: ئیکرام کەریم
- ناوی زنجیرە: زنجیرەی پەیامەکانی گەنجان
- ژمارەی زنجیرە: نۆزدەهەم
- تیراژ : ١٠٠٠ دانە
- نۆبەی چاپ: یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٣
- ژمارەی لاپەڕە : ١٠٧ لاپەڕە
- دیزاین : گۆڤاری ڕێنوێن
- چاپ : چاپخانەی ڕێ نوێ
- سەرپەرشتیکار : سەرکۆ کریم احمد
- ئیمەیڵ: renwen٢٠٠٩@yahoo.com
- ماڵپەڕ: www.aubyc.com

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٨٩٨)ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێدراوە


**ئەم بەرهەمە تەعبیر لە بۆچونی نوسەر دەکات**

## پێشەکی

سوپاس بۆ خواو درودو سەلامیش بۆ پێغەمبەری ئیسلام و هەموو پێغەمبەران..

کاتێك کتێبی "پوختەیەك لە کتێبی بنەماکانی ئیسلام"م نووسی باسی قەزاو قەدەرەکەی بووبە جێگەی مشتومڕ، لەسەر پێشنیاری کۆمەڵێك گەنج کەداوایانکرد کتێبێکی سەربەخۆ لەو بارەیەوە بنووسم یان روونکردنەوەی زیاتر بدەم لەسەر هەندێ بابەتی ناو ئەو باسە وەك:

- سڕینەوەو گۆڕینی قەدەرەکان
- ئیرادەی خواو ئیرادەی مرۆڤ و ئیرادەی شەیتان
- کەم و زیادکردنی تەمەن و ئەجەل
- نووسینی رزق و بەڵاکان و تەمەن و چارەنووس لەسکی دایکەوە..

منیش پشتیوان بەخوای پەروەردگار روونکردنەوەی زیاترم دا لەسەر ئەو بابەتەو وەڵامی ئەوجۆرە پرسیارانەشم بەپێی توانا دایەوە کە لەرووبەکەوە یان زیاتر پەیوەندن بەمەسەلەی قەزازو قەدەرەوەو بەم شێوەیە بوویە کتێبێکی سەربەخۆ وەك ئەیبینن، خۆشم زۆر بەدوورگرت لە ئەو هەمووە خیلافە کەلامی و فەلسەفیانەی کە زانایان ئاڵاندوویانە لەباسە عەقیدەییەکان بەگشتی و ئەم باسی قەزاو قەدەرە بەتایبەتی، بۆ چێژبردنی زیاتر لەهەندێ شوێندا شیعری مەولەویم بەکارهێناوە، بۆیە بەناشیرین وحەیفی ئەزانم ئاماژەی بۆنەکەم، ئەبومحەممەد -رزق الله-ی تەمیمی حەنبەلی(٤٠٠-٤٨٨ك) -بەرەحمەت بێت- جوان ئەفەرموێ: (يقبح بكم أن تستفيدوا منا، ثم تذكرونا ولا تترحموا علينا)[١]، جوان نیەو ناشیرینە

---

[١] سير اعلام النبلاء، الذهبي(١٨/٦١٣).

بۆ ئێوە سوودمان لێببینن و پاشان کە ئەکەوینە بیرتان ڕەحمەتێکمان بۆ بنانێرن!، وەنەبێت مەولەوی هەرچی وتبێت هەرچاك بێت و هەڵەی نەوتبێت، نا.. مەولەویش وەك ئەو هەمووە زانا پایەدارەی ئیسلام وایە کە ئیجتیهادیانکردووەو لەهەندێ شتدا پێکاویانەوە لەهەندێکی تردا کەوتوونەتە هەڵەوە، من بڕوام وایە مەولەوی شتی جوانی وای هەیە لەجوانەکانی خەلکی جوانترن، شتی واشی هەیە ئەگەر بۆکاتی خۆشی جوان بوو بێت و کەس ڕەخنەی لێی نەبووبێت ئەوە بۆ ئێستاو لەم سەردەمی گوگڵ و ئینتەرنێت و توێژینەوەی زانستیەدا بەهیچ جۆرێك بەرگەی موناقەشە ناگرێت!و ئەوەش لەگەورەیی مەولەوی نایەنێتەخوارەوەو ئەرکی ئێمەیە بلێین: (رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ)، ئەم دوعایەش ئەگەر سوودی بۆ ئەو پایەبەرزانە نەبێت ئەوە خوا ئێمەی فێرنەکرد بیخوێنین! چونکە خۆ خوا خەڵك فێری شتی عەبەس و نابەجێ ناکات؟

هیوادارم خوای گەورە بەرچاومان ڕوونبکاتەوەو ئەوەی ڕاستەو دروستە بیلێین و بینووسین و کاریگەری باشیش بداتە ناوی، چونکە هەر ئەوە ئەتوانێ دەستکاری دڵەکان بکات و ڕوویان بکاتە ئەوەی ئەو ئەیەوێت و پێی ڕازییە..

(وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (١٠٥)

ئیکرام کەریم لە١ی١٢ی٢٠١٢ نووسیویەتی



## تێبینییەك لەم باسەدا

"قەدەر" یانی ئەندازەگرتن و نەخشەكێشان بۆ كارێك، "قـەزا"ش یـانی بڕیاردان لەسەر كارەكەو جێبـەجێكردنی، هـەردوو وشـەی"قـەزاو قـەدەر" پـێش تەرجەمەكردنی فەلسەفەی یۆنانی كەس نەبووە پێكەوە بەكاری هێنابن: نەقورئان و نەحەدیس و نەصەحابەو نەلەڕێزمانی عەرەبیشدا بەكار نەبراون[١]، بـۆ یەكـەم جـار موتەكەلیمە ئیسلامیەكان ئەم دوو وشـەیان بەیەكـەوە بـەكاربردووە پـاش ئـەوەی كەفەلسەفەی یۆنانیان تەرجەمەكردو ناچاری ئەوە بوون وەڵام بۆ ئەو بابەت و ڕیسا فیكریانە بدۆزنەوە كە زانستی كەلام هێنانیە پێشـەوە، ئەگـەر بـەوردیش سـەیری باس و بابەتەكانیان بكەیت لەسەر ئیرادەو ئیختیـارو خـەلق و كەسـب و...بـۆت دەرئەكەوێ كە ئەو بابەتانە بابەتی زانستی كەلامن نەك بابەتی شـەرعی ئیسـلام، بۆیـە راسـت وایـە ئـەم باسـە تێكـەڵ نەكرێت لەگـەڵ كـاروكردەوەی "خولقـاوە بەئیرادەكان"دا وەك مرۆڤ و پەریەكان "الانس و الجن" بەڵكو ئەبێ زیـاتر لەباسـی دروسـتكردنی ئاسمانـەكان و زەمـین و ژیـان و مـردن و سـیفەتی"علـم"ی خـوادا باسبكرێت، چونكە وەك هەندێ لەزانایان باسی ئەكەن مرۆڤ بەگشتی لـەنێوان دوو بازنەدا ئەژی: بازنەیەك دەسەڵاتی بەسەر ئەمدا هەیە و پەیوەندی بەئەمەوە نیـە، بازنەیەك مرۆڤ دەسـەڵاتی بەسەرِیدا هەیەو پەیوەندە بەئەمـەوە، ئـەو بازنـەی كـە دەسەڵاتی بەسەر مرۆڤدا هەیەو پەیوەندی بەئەمـەوە نیـە دوو بەشـە: بەشـێكیان قەزاو قەدەرەكانی هەموو هی خوان و دوور لەئیرادەو بەشداری ئەم روونەدەن، وەك:

[١] هەرچەندە مەولەوی بلیمەت ئەفەرموێ:" قەدەر موستەلزیم لەبۆ قەزایە..... بۆ وە بەتەصریح حەدیس پێی نایە" یانی قـەدەرو قـەزا لازم و مـەلزومی یـەكترین بۆیـە حەدیسیش بەصـەریح نـاوی قـەزای نـەبردووەو هـەر تـەنیا فەرموویەتی( وان تؤمن بالقدر خیرە وشرە)، بڕوات بەقەدەر هەبێت چ خێری و چ شەڕی، یانی: كەناوی ئـەمیانت بەتەنیا برد ئەوە ئەویشیانت مەبەستە.. بڕوانە: عەقیدەی مەرضییە، مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس، لاپەڕە:٦٧٧.

جوولـەو بەڕێوەچـوونی ئاسمانـەکان و شـەوو ڕۆژو چـوار وەرزەی سـاڵ و سـەرماو گەرماو زەمین لەرزە...هتد، ئەمانە لەڕووی نەخشەو بەرنامەیەکەوە روونەدەن کـە نەپرس بـە مـرۆڤ ئـەکرێت و نـە لێپرسینەوەشـی لەگەڵـدا ئـەکرێت لەسـەر ئـەو شتانە..بەشێکی تریان قەدەرەکانی کاری خـوان و قـەزاکانی هـی مـرۆڤن، ئەمـە قەدەری خوایە ئاگر بسووتێنێت و چەقۆ شت ببڕێـت و ژەهـر شـت بکوژێـت و ژن منالی ببێت و زسـتان سـارد بێـت و هـاوین گـەرم بێـت...بـەو شـێوەیە، بـەلاّم بەکارهێنانەکانی لەلایەن مرۆڤەوە ئەوە قەزایەو لێپرسینەوەی لەسەرە..

ئەو بازنەیەش کە مرۆڤ دەسەلاّتی بەسەریدا هەیـە بریتییـە لـە بازنـەی کاری ئەم مرۆڤە کە بـە ئـیرادەو بڕیـاری خـۆی ئـەیانکات، و قەدەرەکانیشـی و قەزاکانیشی پەیوەندن بە مرۆڤەکە خۆیەوە، یانی خۆی نەخشـەی بـۆ ئەکێشـێت و خۆشی جێبەجێیانئەکات، و بـەو شـێوەیەش جێگـەی خۆیـەتی لـەرووی شـەرع و لەرووی یاساو لەرووی عەقڵیشەوە لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت، جا ئەگەر باشـی کردبوو پاداشت بدرێتەوەو ئەگەر خراپیکردبوو ئـەوە سـزا بـدرێت یـان بەپاسـاوی دروست ببەخشرێت،

بەلاّم بابەتی"عیلمی ئەزەلی خـوا بـە هـەموو شـتێك و نووسـینی ئـەو عیلمە شامیلەش لە لەوحولمەحفوزدا" ئـەوە پەیوەنـدی بـەم مرۆڤـەوە نیـەو ئـەو زانستە مرۆڤی خاوەن ئیرادە ناچار ناکات بە هیچ کارێك، چونکە مرۆڤیش لـەرێی ئەو نەخشانە ناوەستێ و هیچ ئەکات، بەڵکو خۆی نەخشە بۆ ژیانی خۆی دائـەنێت و بەو شێوەیەش نەخشەکانی خۆی جێبەجێ ئەکات نـەك ئـەو نەخشـانەی کـە لـە لەوحولمەحفوزەوە بۆی دێن! ئەمـەش دژ ناوەسـتێتەوە لەگـەڵ ویسـت و ئـیرادەی خوادا-وەك لە دواوە باسینەکەین-، چونکە خـوا دوو جـۆر خولقـاوی هەیـە: بـێ

ئیرادەکان و خاوەن ئیرادەکان، بێ ئیرادەکان بە قەدەرو بە قەزای خوا ئەڕۆن بەڕێوەو کۆنترۆڵیان لای خۆیان نییە، خاوەن ئیرادەکانیش کەمرۆڤ و پەریەکانن خوای گەورە لەکارەکانی خۆیاندا سەربەستی کردوون و کۆنترۆڵەکانی داوەتە دەست خۆیان و سەیرەدەکات بزانێ چۆن کار دەکەن و چی دەکەن، ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ مِنْ بَعْدِهِمْ لِنَنْظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾[1] ، ئێمە پاش ئەوان ئێوەمان کردە جێنشینی یەکتری لەسەر زەویدا تا سەیربکەین بزانین چۆن ئەکەن و چی ئەکەن.

ئەکرێ درێژتر بڵێین: سێ بازنە بۆ ئەو زانیاریە تۆمارکراوانە سەبارەت بە دنیاو بوون-نەك جیهانی خوایەتی و نادیارو لەوحەلمەحفوز- هەیە وەك لەپێشەوە وتمان: بازنەی بوونەوەرو گەردوون-سیستەم و بەرنامەو تەمەنی ئاسمان و ئەستێرەو هەسارەکان-، بازنەی سەرزەوی و ژیانی دنیایی-بەرنامەو تەمەنی دەریاو وشکانی و ژینگەو وەرزەکانی ساڵ-، بازنەی ژیانی مرۆڤ-بەرنامەو لەدایکبوون و ژیان و مردن وکارو بەرنامەکانی- کە ئەم بازنانە لەوەدا هەموو وەك یەکن کە خوا زانیاری پێیان هەیەو درێژەی ئەو زانیاریانەی خۆشی لەسەریان تۆمارکردووە، بەڵام بازنەی ژیانی مرۆڤ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ ئەوانی تردا ئەویش ئەوەیە ئەم بازنەیان با زانیاری تەواویش لەسەری تۆمارکراوە، بەڵام قابیلیەتی ئەوەی هەیە کەدەستکاری ئەو زانیاریانەبکرێت و بگۆڕدرێن، ئەکرێ بۆ زیادەتێگەیشتن سەیرێکی ئەم هێڵکاریە بکەین:

[1] بەمانا لە کتێبی(نظام الإسلام، تقي الدين النبهاني، ص:١٢– ١٩)وەرگیراوە.



بۆ زانینی ئەم راستیە ئەتوانی بێ دیاریکردن دەمی قورئانەکەت بکەیتەوەو ئەمبەرو ئەوبەری پەڕەیەك بخوێنیتەوەو وردبیتەوە تا بزانی: ئەپێغەمبەران و ئەجگە لەوانیش دانەنیشتوون و هیچیان نەکردبێت تا نەخشەی رۆژانە یان مانگانە یان ساڵانە یان هی تەمەنیان بۆ ئەگوازرێتەوە لە لەوحولمەحفوزەوە، بەڵکو هەموو هەستاون بەرەی کەعەقڵی خۆیان بڕیریەتی و نەخشەیان بۆ داناوەو کاریان بۆ بەدەستهێنانی ئەو نەخشانە کردووەو پاشان داوایان لەخوا کردووە پشتیوانیان بکات بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی ئەیخوازن و بیانپارێزێت لەهەموو ئەوشتانەش کە لێینەترسن و سەریانبخات بەسەریدا.. خوای گەورە ئەفەرموێت:

(وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ).. پێشیان بڵێ: دەی خەریکی کاربن! دڵنیابن[١] خوا کارەکەتان ئەبینێت هەروەها پێغەمبەرو ئیماندارانیش و پاش

---

[١] زانایان ئەڵێن: ئەو "س"ە لە وشەی "فسیری"دا بۆ تەئکیدە، بڕوانە تەفسیری ئالوسی(ئایەتی-١٠٥ی سورەتی تەوبە).

ماوەیەکی کەم[١] ئەگەڕێنرێنەوە بۆلای زانای نادیارو دیار ئەوکاتە هەواڵی ئەو کردەوانەتان ئەداتێ کە کردووتانە..

## چەند بنەمایەك پێش دەستپێکردن

بۆ ئەوەی بەدروستی توێژینەوە لەبابەتی"قەزاو قەدەر" بکەین پێویستە چوار بنەما هەیە بەردەوام لەبەر چاومان بێت:

یەکەم: خوای پەروەردگار دووره لەوەی کە ستەم لە بەندەکانی بکات و تۆسقاڵێك زوڵمیش چییە لەبەندەکانی نایکات، نە لەدونیاداو نە لەئاخیرەتدا، بۆیە بۆ قیامەت فەرموویەتی: (وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ (٤٧)، ئێمە ترازووی داد بۆ رۆژی قیامەت دائەنێین، بۆیە هیچ کەسێك هیچ جۆرە ستەم و ناهەقییەکی بەرانبەرناکرێت، جا ئەگەر تۆسقاڵێك لە ناوکی خەرتەلەیەکیش شت هەبێت ئەوە ئەیخەینەڕوو، ئەوە بەسە کە ئێمە لێپێچینەوە دەکەین.

بۆ دونیاش فەرموویەتی:(مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ)، هەرکەس ژیانی دونیاو بریق و باقی ئەم ژیانەی بوێت ئەوە ئێمە بەتەواوەتی هەقی کردەوەکانیان پێئەدەین و هیچیشیان لێکەمناکەینەوە.

دووەم: خوا بەندەکانی خۆی ناخەڵەتێنێت و درۆیان لەگەڵدا ناکات"سبحانه وتعالی" و هەر قسەیەکی بۆ کردن و هەر بەڵێنێکی پێدان ئەوە ئەیباتەسەر، وەك

[١] "س"و"سوف" بۆ داهاتوو بەکار ئەهێنرێن،"سوف" بۆ داهاتووی دوورو"س" بۆ داهاتووی نزیك، ئێمەش بۆیە وا مانای ئایەتەکەمان کرد.

فەرموویەتی: (قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٨) وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٣٩) بە ئادەم و حەواو شەیتانمان وت: هەموو دابەزنە سەر زەوی، جا کە ئایینی پڕهیدایەتی منتان بۆ هات ئەوە بزانن هەرکەس شوێن هیدایەتی من بکەوێت ئەوە نە ترسی دوارۆژی ئەبێت و نە خەفەت لەرابردوو ئەخوات.

دەی ئەگەر وردببینەوە لەقورئان ئەبینین کەخوای گەورە زۆر شتی سەلماندووە بۆ ئەم مرۆڤە، بۆ نمونە ئەفەرموێ:

- مرۆڤ ئازادە لەهەڵبژاردنی ئایینداو بەزۆر نەدین و نەبێدینی نادرێت بەسەریدا، خوای گەورە ئەفەرموێ:(وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ)، بڵێ: ئەوە لای پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتووە هەق و راستیە، جا هەرکەس ئەیەوێ با ئیمان بهێنێ و هەرکەسیش ئەیەوێ با بڕوات بێدین بێت.
- مرۆڤ خاوەنی ئیرادەی خۆیەتی و ئەتوانێت ئەو ئیرادانە ئیش پێبکات، بۆ خێر بێت یان بۆ شەڕ بێت، خوای گەورە ئەفەرموێ:(مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ نَصِيبٍ)، هەرکەس ئارەزووی لە کێڵگەی ئاخیرەت هەیە ئەوە پێینەدەین و بۆی زیادئەکەین و هەرکەسیش کێڵگەی دونیای ئەوێ ئەوە بەشی ئەدەین و لە ئاخیرەتدا بەشێکی نیە.
- مرۆڤ ئەتوانی گۆڕان دروست بکات، چاك بگۆڕێت بۆ خراپ و خراپ بگۆڕێت بۆ چاك، خوای گەورە ئەفەرموێ:(ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ). ئەوەش لەبەر ئەوەیە

کەخوا هەرگیز نیعمەتێك ناگۆڕێت کە رشتوویەتی بەسەر میللەتێکدا کاتێك نەبێت کەخۆیان هەل و مەرجەکان بگۆڕن و خواش بیسەری قسەیەو زانایە بە نیازی ناو دڵەکان.

● مرۆڤ ئەتوانێ تەزکییەی دەروونی خۆی بکات یان دەروونی چڵکن و پیسبکات، وەك ئەفەرموێ:( وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (٧) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (٨) قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا (٩) وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا (١٠)، سوێند بە دەروونەکان و ئەو کەسەی دروستی کردوون، ئەوجا خێری خۆیان و شەڕی خۆیانی فێرکردوون، بەدڵنیاییەوە ئەو کەسە سەرکەوتوو ئەبێت کە دەروونی خۆی پاکبکاتەوەو تەزکییەی بکات، ئەو کەسەش تێکنەشکێت کە دەروونی خۆی لەگوناه بتالێنێ.

سێیەم: هەم دونیاو هەم ئاخیرەت بەبەکارهێنانی ئەسباب دەستنەکەوێت، ئاخیرەت بەخواناسی و عیبادەت دەستنەکەوێت و خوا بەبێ هەوڵ و عیبادەت کەس ناخاتە بەهەشت وەك ئەفەرموێ:(هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا أَنْ تَأْتِيَهُمُ الْمَلَائِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انْتَظِرُوا إِنَّا مُنْتَظِرُونَ (١٥٨)، ئایا چاوەڕوانی چی ئەکەن ئەوە نەبێت کە فریشتە بێتە سەریان یان پەروەردگارت بۆخۆی بێت بۆ لایان یان هەندێ موعجیزەی پەروەردگارت بێتە لایان، ئەو رۆژەی کە هەندێ لە موعجیزە گەورەکانی خوا دێتە سەریان ئیمانهێنان هیچ سوودێکی بۆیان نابێت مادامێك پێشتر ئیمانیان نەهێناوە یان هیچ کارێکی چاکیان ئەنجامنەداوە لەکاتی ئەو ئیمانهێنانەدا، بڵێ: مادامێك وایە دەی چاوەڕێ بکەن ئێمەش چاوەڕێ دەکەین.

هەروەها ئەفەرموێت:( وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ كَانَ سَعْيُهُمْ مَشْكُورًا (١٩)، هەرکەس تـاخیرەتی بوێـت و هـەوڵی خـۆیی بـۆ بـدات و هاوزەمان ئیماندار بێت ئەوە ئەو کەسانە هەوڵەکانیان جێگەی سوپاسە.

دونیاش هەر بە هەوڵ و کارکردن دەستئەکەوێت خوا دونیا نادات بەکەسێك کـە هەوڵی بۆ نەدات بەشێوەیەك لەشێوەکان:

- ئەخۆش ئەبێ چارەسەر بەکاربهێنێت ئەوجا خـوا شـیفای بـۆ ئـەنێرێت، پێغەمبەر(صلى الله عليه والەوسـلم)ئەفـەرموێت:(إِنَّ اللَّـهَ عَـزَّ وَجَـلَّ أَنْـزَلَ الـدَّاءَ وَالدَّوَاءَ، وَجَعَلَ لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءً، فَتَدَاوَوْا وَلا تَدَاوَوْا بِحَرَامٍ)[١]، واتە: خوای گەورە هەم دەردو هەم دەرمانیشی ناردووەتـە خـوارەوە و دەرمـانی بـۆ هـەموو دەردێکـیش داناوە، دەی ئێوەش دەرمان و چارەسەرەکان بەکاربهێنن و بەشتی حەرام چارەسەری خۆتان مەکەن.

- هەژار ئەبێ دەستبداتە کارێك ئەوجا خوا رزقـی بـۆ ئەنێرێت،پێغەمبـەر (صلى الله عليه والەوسلم) ئەفەرموێت:(لـو أنكـم توكلـون علـى الله حـق توكلـه، لرزقتم كما ترزق الطير، تغدو خماصًا وتروح بطانًا)[٢]، واتە: ئەگـەر ئێـوە بەڕاسـتی پشت بەخوا ببەستن ئەوە وەك چۆن رۆزی باڵندە ئـەدات واش رۆزی ئێـوە ئـەدات، بەیانی زوو بەسکی بەتاڵەوە ئەچێتەدەرو ئێوارە بەسکی پڕەوە دێتەوە!

ئەوەتا خوا رزقی باڵندە ئەدات بەلام بۆی ناخاتە نـاو هێلانەکـەی! بـەڵکو ئـەبێ بەیانی زوو بکەوێتەڕێ بۆ بەدەستهێنانی رزقی خۆی!

---

[١] الاداب، البيهقي، باب: النهي عن التداوي بالمسكر،(٤٠٩/١)

[٢] أخرجه الترمذي، جامع الاصول من احاديث الرسول، ابن الاثير، ژمارەی فەرموودەکە(٧٦١٩).

- نەزان نەبێ دەستبداتە خوێندن ئەوجا خوا زانستی فێرئەکات: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ..).
- بێدەسەلاَت نەبێ هەوڵ بۆ دەسەلاَت بدات ئەوجا خوا دەسەلاَتی ئەداتێ: (أَنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ). خوا هەل و مەرجی هیچ میللەتێك ناگۆڕێت تا ئەوان ئەو شتانە نەگۆڕن کە ئالاَوە لەدەروونیان و خواش ویستی وابوو کە میللەتێك تووشی سزایەك بکات ئەوە کەس ناتوانێ رەتیبکاتەوەو ئەو میللەتەش جگە لەخوا پشتیوانێکیان بۆ نییە.

پێغەمبەریش(صلی الله علیە والەوسلم)وەك ئەبو ئومامەی باهلی ئەگێڕێتەوە لێی کە فەرموویەتی: (لَيُنْقَضَنَّ عُرَى الإِسْلاَمِ عُرْوَةً عُرْوَةً فَكُلَّمَا انْتَقَضَتْ عُرْوَةٌ تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِى تَلِيهَا وَأَوَّلُهُنَّ نَقْضاً الْحُكْمُ وَآخِرُهُنَّ الصَّلاَةُ.)[1].
هەڵقەکانی ئیسلام هەڵقە هەڵقە ئەکرێنەوە، هەرکە هەڵقەیەك ئەکرێتەوە خەڵکی دەست بەوەی دوای ئەوەوە ئەگرن، یەکەمین هەڵقە کە ئەکرێتەوە نەمانی دەسەلاَتەو کۆتایەمینیش بریتییە لە نوێژ.

کەواتە دەسەلاَت نەپارێزیت لەدەستت ئەڕوات و هەوڵی بۆ نەدەیتەوە نایەتەوە.

چوارەم: دەقەکانی شەریعەت نەك دژایەتی یەکتری ناکەن بەڵکو یەك ئەوی تر قایمتر ئەکات، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ:( أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا)، ئەوە بۆ لەقورئان وردنابنەوە، خۆ ئەگەر

[1] اخرجه أحمد ٥/٢٥١(٢٢٥١٣)

لەجگە لەخواوە بهاتایە ئەوە ناكۆكیەكی زۆری تێدا ئەبوو، جا بۆ ئەوەی كە نەكەوینە چزكردن و تەئویلكردنی دەقی شەرعی ئەبێ ئەوە بزانین كە حوكمی هیچ مەسەلەیەكی شەرعی: عەقیدەیی بێت یان شەریعەتی بێت[1] بەتەنیا لە ئایەتێك یان لە حەدیسێك وەرناگیرێت، بەڵكو ئەبێ هەموو ئەو ئایەت و حەدیسانەی كە لەو بابەتەدا هاتوون ریزبەندیبكرێت و لەگەڵ یەكتری بگونجێنرین و ناكۆكییە رووكەشەكانیان نەهێڵرێن:

لەم مەسەلەی قەزاو قەدەرەشدا كۆمەڵێك ئایەتی زۆرو كۆمەڵێكی زۆرتر حەدیس هەن كە لەرووكەشدا بەیەك ناخۆن و ئەوەشی مەسەلەكەی ئاڵۆزكردووە- لەراستیدا- قسەو راجیاوازەكانی زانایانە، جا ئەگەر هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانەی بۆ نمونە لەسەر( قەزاو قەدەر )هاتوون، كۆیانبكەینەوە بۆمان دەرئەكەوێت كە لەسێ كۆمەڵدا كۆئەبنەوە:

كۆمەڵێكیان: مرۆڤ بەتەواوەتی ئازادئەكەن لەویست و لە هەڵبژاردن و لەكارەكانیداو جۆرێك لە بێمننەتبوون لەخوایان لێوەئەخوێنرێتەوە بەرووكەش.

كۆمەڵێكیان: مرۆڤ بەتەواوەتی ئەخەنە ژێر كۆنترۆڵ لەویست و لەهەڵبژاردن و لە كارەكانیداو جۆرێك لەحەسێبنەكردن و وەك داروبەرد سەیركردنی مرۆڤیان لێوەئەخوێنرێتەوە بەرووكەش.

كۆمەڵێكیان: مرۆڤ ئازاد ئەكەن و ویست و هەڵبژاردن و كارەكانیشی پەیوەستئەكەن بە ویست و هەڵبژاردن و كارەكانی خوای پەروەردگارەوە.

بۆ نمونە خوای گەورە ئەفەرموێ:

- اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ

[1] عەقیدەیی وەك مەسەلەی قەزاو قەدەر بۆ نمونە، شەریعەتیش وەك مەسەلەی ئیسبال بۆنمونە.

- وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِمِقْدَارٍ
- وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ.
- قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ.
- وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ....الخ الايات.

هەروەها ئەفەرموێ:

- كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ
- إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا
- قَدْ جَاءَكُمْ بَصَائِرُ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِحَفِيظٍ....
- وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ
- وَقُلْ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ....الخ الايات.

کۆمەڵێکیش فەرموودەی بەرووکەش ناکۆك هەن لەم مەسەلەیەدا:

- إن الله خلق للجنة أهلاً خلقهم لها وهم في أصلاب آبائهم وخلق للنار أهلاً خلقهم لها وهم في أصلاب آبائهم
- لكُلّ شيء حقيقة ، وما بلغ عبدٌ حقيقةَ الإيمان حتى يعلم أنَّ ما أصابه لم يكن ليُخطئه ، وما أخطأه لم يكن ليُصيبه .
- إن الشقي من شقي في بطن أمه ، وإن السعيد من وعظ بغيره.

- أرْبَعٌ لَنْ يَجِدَ رَجُلٌ طَعْمَ الإيمَانِ حَتَّى يُؤْمِنَ بِهِنَّ : لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ ، وَأنِّي رَسُولُ الله بَعَثَنِي بِالْحَقِّ ، وَأنَّهُ مَيِّتٌ ، ثُمَّ مَبْعُوثٌ بَعْدَ الْمَوْتِ ، وَيُؤْمِنُ بِالْقَدَرِ كُلِّهِ.
- رفعت الاقلام وجفت الصحف...

لەلایەکی ترەوە ئەفەرموێ:

- " المُؤْمِنُ القَوِيُّ خَيْرٌ وَأحَبُّ إلى اللَّهِ تَعالى مِنَ المُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وفي كُلٍّ خَيْرٌ، احْرِصْ على ما يَنْفَعُكَ، واسْتَعِنْ باللَّهِ ولا تَعْجِزَنَّ وإنْ أصابَكَ شَيْءٌ فَلاَ تَقُلْ:لَوْ أنِّي فَعَلْتُ كَذَا كانَ كَذَا وَكَذَا،وَ لَكِنْ قُلْ قَدَّرَ اللَّهُ وَما شاء فَعَلَ،فإنَّ" لَوْ"تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطانِ"[١].
- " اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُما كُنْتَ، وأتْبِعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُها، وخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ"[٢].
- "الدعاء يرد القضاء، وإن البر يزيد في الرزق، وإن العبد ليحرم الرزق بالذنب يصيبه"[٣]...الخ الاحاديث.

لەبەر ئەمەیە ئەو کەسانەی کە تەنیا لەیەك گۆشەنیگاوە بۆ قەزاو قەدەر ئەڕوانن ئەکەونە هەڵەوە، یان خۆیان تووشی جەبرییەت ئەکەن و ناچاری تەئویل و تەحریفکردنی ئەو هەمووە ئایەت و حەدیسانە ئەبن کە باس لە ئازادی و ویست و کارو کاریگەری عەبد ئەکەن، یان خۆیان تووشی بیری قەدەرییەت ئەکەن و ناچاری ئەوە ئەبن ئەو جورئەتە بدەن بەخۆیان کە ئەو هەمووە حەدیسە صەحیحەی

---

[١] الاذكار، للامام النووي.

[٢] الاذكار، للامام النووي.

[٣] ژمارە:"٢٥٥٧" لە کتێبی" الجامع الصغير في أحاديث البشير النذير"، جلال الدين عبد الرحمن بن أبي بكر السيوطي.

پێغەمبەر(صلی اللەعلیە والەوسلم) کە هاتوون بدەنە دواوەو مانـای هـەموو ئـەو ئایەتانەش تەئویل و تەحریفبکەن کە باس لە ویستی رەهای خواو بڕیـاری هـەموو کات و ساتێکی خوا ئەکەن، بەلاّم لەڕاستیدا نەئەوە عەقڵ و ئازایاتیە کە ئەمیان بکەیت و نەئەوەش عەقڵ و ئازایەتیە ئەویان بکەی، چونکە مرۆڤ ئازادە بەلاّم نەك بە موتڵەق-وەك خوای گەورە-، ناچاریشـە ئـەویش نـەك بـە موتڵـەق-وەك شـتە بێگیانەکان-، یـانی وەك فەیلەسـوفەکان ئـەڵێن:" مـرۆڤ ئـازادە لـە دونیایـەکی پڕسـنووردا"[1]، یـان وەك ئـەوەی هەنـدێ لـەزانایان پـاش توێژینەوەیـەکی ورد گەیشتوونەتە ئەوەی بڵێن:(مرۆڤ خولقاوێکی ئازادی ناچارە)[2]، یان(مـرۆڤ شـتێکە لەنێوان ئەمیش و ئەویشدا)[3]، چونکە مرۆڤ وەك ئـەو خولقاوانـەی تـر نییـە کـە کۆنترۆڵی لای خۆی نەبێت و ناچاری تەواو"جبر محض"بێت و بەوشێوەیە بجوڵێـت کەفەرزکراوە لەسەری، مرۆڤ لەلایـەکی تریشـەوە ئـازادی تـەواو نیـە وەك خـوای پەروەردگار-سبحانەو تعالی- هەرچی ویست و نەخشـەی بۆدانـا کـەس نـەتوانێت رایبگرێت، بەڵکو مرۆڤ ئازادە لەڕوویەکـەوەو ناچـارە لەڕوویـەکی تـرەوە وەك لـە باسەکانی دواتردا ئەمە ڕۆشننەکەینەوە لەڕووی بەڵگەوە..

---

[1] دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية، عرفان عبدالحميد، ص٢٨٨.

[2] ئەگەر وردبیتـەوە لـەم مرۆڤـە بۆتدەرنەکـەوێت لەچـەند شـتدا ئـازادە لەئەوەنـدەو هـەزار ئەوەندەشـدا ناچـارو بێئیختیارە، بۆنمونە: ئیش و کاری جەستەی خـۆی لەکاتێکـدا ئـەو خـەوتووەو هـیچ ئاگـای لـەخۆی نییـە لەیـەك ساتەوەختدا ملیۆنەها ئیش بەڕێنەکرێت لەجەستەی خۆیدا بێ ئـەوەی ئـەو هەرئاگاشـی لێـی هـەبێت! یـان پرسـی پێبکرێت! هەروەها لە گەردیلەیەکەوە تا گەلەئەستێرەیەك کە هەموو جەبری چواردەوری ئەم مرۆڤەیە مـرۆڤ ناچـارە تێیداو پرسی پێناکرێت..

[3] لە جەعفەری صادیقەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویەتی:" لاجبر ولا تفویض، لنما امر بـین امـرین" ، بڕوانـە"تصـحیح عقائد الشیعة الامامیة، المفید،ص١٤".

زانایان بۆ نەهێشتنی ناکۆکی رووکەش لەنێوان دەقەشەرعیەکاندا چەند بنەمایەکیان داناوە خراپ نییە بەکورتی باسیانبکەین:

هەنگاوی یەکەم: (دڵنیابوون لەهەردوو دەقەکە)، لەرووی (سند)و لەرووی (متن)و لە رووی (مانا)وە.

هەنگاوی دووەم: هەماهەنگی و یەکخستنی ئەو دوو دەقە: بە جیاکردنەوەی بابەتەکانیان بۆ نموونە، یان پلەکانیان، یان حوکمەکانیان.

هەنگاوی سێیەم: سەلماندن و قەبولکردنی یەکێکیان و رەتکردنەوەی ئەوی تریان: لە رووی (مرجحات)ەوە نەك لە رووی حەزو ئارەزووبازییەوە.

هەنگاوی چوارەم: کارکردن بەرێسای نەسخ و سڕینەوەی حوکمی یەکێك لەدەقەکان: پاش دڵنیابوون لەمەرجەکانیو لەمێژووی دوو دەقەکە.

هەنگاوی پێنجەم: رەتکردنەوەی حوکمی هەردوو دەقەکە یان یان هەڵبژاردنی یەکێکیان یان لێوەستان لێیان تا توێژینەوەی زیاتری لەسەر بکرێت.

زانایانی ئیسلامی چەند رایەکیان هەیە لەسەر ئەم ریزبەندییە، هەیانە پاش هەنگاوی یەکەم هەنگاوی چوارەم پێش سێیەمو دووەم ئەخات، وەك دکتۆر زەیدان لە (الوجیز: ص٣٩٦)دا، هەیشە هەنگاوی چوارەم ئەخاتە سێیەمو سێیەم ئەخاتە چوارەم، هەشە ئەو تەقسیمبەندییە ئەکات کە ئێمە نوسیومانە وەك دکتۆر موستەفا زەڵمی لە (التبیان ص٣٩ـ ٤٠)دا، ئێمە لەبەرئەوەی چ (شەرع)و چ (عەقڵ)و چ (ئیجماع) پشتی ئەو ریزبەندییە ئەگرێت، ئەومان بە راستتر زانی و هێنامان، بۆ ئەمەی کە شەرع وا ئەڵێ: خوای گەورە ئەفەرموێ: "اتبعوا ما أنزل الله الیکم"شوێن ئەو شتە بکەون کە خوا بۆی ناردوون! بۆیە دروست نیە هەروا لەخۆڕا دەست بنرێت بە دەقێکەوە کەبابەتێك باسئەکات، عەقڵیش ئەڵێ: (نەسخ

لقێکی(تەناقوض)، کاتێك ئەبێت پەنای بۆ ببرێت کە مومکین نەبێت ئەو دوو دەقە کۆبکرێنەوەو هەردووکیان پێکەوە کاریان پێبکرێت، ئیجماعیش ئەڵێ: زانایان یەکدەنگن لەوەدا کە: لابردنی"تعارض" ئەبێ بە کۆکردنەوەو پاشان تەرجیحدان و پاشان نەسخکردندا بڕوات، نەك بە پێچەوانەوە.[1]

دەی کەسەیری ئەو ئایەت و حەدیسانە ئەکەین دەربارەی قەدەرو قەزا هاتوون هەموو ئەم ڕێسا شەرعیانەیان بەسەریاندا جێبەجێ دەبێت، هەموو ئەو حەدیسانەی کە باس لەنووسینی قەددەرەکان ئەکەن یان باس لەقەزاکان و موبرەمیی قەزاکان ئەکەن ئەبێ لەژێر ڕۆشنایی ئەو حەدیسانەدا مانایان بکرێن کە باس لە گۆڕین و سڕینەوەیان ئەکەن بەدوعاو صەدەقەو کاری دروست و هەوڵی بەردەوام، چونکە نابێ ئەوەی پەیوەندی بەخواوە هەیە دژبەیەك بن وەك خۆی ئەفەرموێ:( أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا)، ئەوە بۆ لەقورئان وردنابنەوە، خۆ ئەگەر لەجگە لەخواوە بهاتایە ئەوە ناکۆکیەکی زۆری تێدا ئەبوو..بۆیە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه‌والەوسلم)ئەفەرموێ: (وَاعْلَمْ:أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إلاَّ بِشَيءٍ قَدْ كَتَبهُ اللهُ لَكَ ، وَإِن اجتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إلاَّ بِشَيءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ ، رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ وَجَفَّتِ الصُّحفُ)، مادام بڕوامان وایە کە ئەم هەواڵە هی پێغەمبەرەو ئەویش لەخواوە وەریگرتووەو باسەکە باسی دینە نەك دونیا ئەوە ئەبێ دڵنیابین کە نابێ دژبێت بە دەقێکی تری صەحیح، بەڵکو ئەبێ وامانا بکرێت کە ئەوە مەبەستی قەدەرە موبرەمەکانە کە قابیلی گۆڕان نین نەك مەبەست نەگۆڕو گۆڕاوەکانیش بێت ئیتر لە بازنەی ئاسمانەکاندا بێت یان لە بازنەی زەمیندا بێت یان

[1] التبيان في رفع غموض النسخ في القرآن، د. مصطفى الزلمي، ص(٣٨–٤٠).

لەناو بازنەی مرۆڤدا بێت، نابێ ئەوە مەبەست پێی هەموو قەدەرەکان بێت چونکە ئەو مانایە ئەچێت بەگژ دەیان حەدیسی صەحیحی ترداو ناکۆکی ئەخاتە ناو دەقە شەرعیەکانەوەو ئەوەش هەڵەیەو ترسناکیشە..بەڵام ئەگەر بەوشێوەیەی سەرەوە تەئویلکرا ئەوە دەقەکان سازئەبنەوەو دەرئەکەوێ کە هەر یەکەیان باس لە بابەتێك ئەکات جیایە لەبابەتی ئەوی تریان..

وەك تێبینیش ئەکرێت زانایانی فەرموودەناس کە باس لەفەرموودەکانی قەدەرو قەزا ئەکەن هەموو ئەو حەدیسانە لەو بارەوە ئەهێنن، وەك ئیمامی بەیهەقی بۆ نمونە لە کتێبی"القضاء و القدر"یان"کتاب القدر"ی فەریابی... ئەوەش بۆیە وایانکردووە تا خوێنەر خۆی بەکاری جەمع و تەوفیقکردن لەنێوان ئەو فەرموودانەدا هەڵبسێت و هەروا لەخۆڕا نەنووسێت تەنیا بە حەدیسێك یان دوانەوەو ڕایەکی نادروستیان لێدەربهێنێت و خۆی و خەڵکیش ماڵوێران بکات.

لەمانەوە بۆمان ڕوونئەبێتەوە کە هەر ئایەتێك یان هەر حەدیسێك یان هەر ئیجتهاد و قسەی زانایەك ئەگەر پێچەوانەی یەکێك لەم بنەمایانە بوو ئەوە حەتمەن خراپحاڵیبوونێك هەیە لەمەسەلەکەداو پێویستە ئەو ئایەتە یان ئەو حەدیسە یان ئەو ڕاو ئیجتیهادانە تەئویلبکرێن و بگونجێنرێن لەگەڵ یەکتریداو زوڵم یان بێوەعدی یان گەمەو گاڵتەو دژگوفتاری-تەناقوض- نەدرێتە پاڵ خوای پەروەردگار"عزوجل" لەبەر خراپحاڵیبوونی ئەم یان ئەو، یان لەبەر تەمەڵی ئەم یان ئەوو شۆڕنەبوونەوەی بەناو دەقەشەرعیەکاندا[1]..بۆ نمونە کە یەکێکی وەك

---

[1] سەیرئەوەیە یەکێکی وەك ئەبو حەییانی ئەندەلوسی خاوەنی تەفسیری بەناوبانگی "البحر المحیط" پاش ئەوەی پێی ئەڵێن: کەلبی ئەڵێت: "یمحو الله تعالی من الرزق ویزید فیه ویمحو من الأجل و یزید فیه"، خوا رزقی دیاریکراوی بەندە ئەسڕێتەوەو زیادی ئەکات و ئەجەلی دیاریکراوی بەندە ئەسڕێتەوەو زیادی ئەکات، پێی وترا: کێ ئەمەی پێ وتوویت؟ وتی: ئەبو صالح لە جابری کوڕی عەبدوڵای کوڕی ڕیئابی ئەنصاریەوەو ئەویش لە

عەبدولعەزیزی شامی لە باوكیەوە ئەگێڕێتەوە -كە صەحابەیەكی بەڕێزی پێغەمبەرە(صلی الله علیه والەوسلم)-گوایە ووتوویەتی : ( من لم يحمد الله على ما عمل من عمل صالح وحمد نفسه فقد كفره وحبط عمله ومن زعم أن الله جعل للعباد من الأمر شيئا فقد كفر بما أنزل الله على أنبيائه(!!) لقوله (ألا له الخلق والأمر)، الأعراف:٥٤، هەركەسێك سوپاسی خوا نەكات بۆ كارێكی چاك كە كردوویەتی و سوپاسی خۆی بكات ئەوە سپڵەیی بەرانبەر خوا كردووەو كارەكەشی پووچەڵكاتەوە، هەركەسیش وابزانێ خوا شتێك لەكاروبارەكانی داوەتە دەست بەندەكانی ئەوە بێ بڕوا بووە بەرانبەر بە هەموو ئەو پەیامانەی خوا دایبەزاندووەتە سەر پێغەمبەرەكانی، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە" خولقاندن و بەڕێوەبردنی هەموو بوونەوەر هەر كاری خوایە بەتەنیا"..

---

پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه واله وسلم)، كەچی سەیر ئەوەیە ئەبو حەیان ئەڵێ:"إن صح شيء من ذلك ينبغي تأويله(!)ئەگەر شتێكی صەحیحیش لەو بارەیەوە هاتبێت ئەوە پێویستە تەئویلی بكەین!ئەزانن بۆچی؟ ئەڵێ:(فمن المعلوم أن السعادة والشقاوة والرزق والأجل لا يتغير شيء منها"!! چونكە كامەرانی و ناسۆری و رزق و ئەجەل بە هیچ جۆرێك گۆڕانیان بەسەردا نایەت، تەنانەت كە باسی ئەو دوعایەی ئیبن مەسعودو حەزرەتی عومەریش ئەكات كە وتویانە(اللهم، إن كان اسمي في السعداء فأثبته فيهم، وإن كان في الأشقياء فامحه عنهم واجعله في السعداء)ئەمەش تەئویلئەكات و ئەڵێ :( ينبغي أنْ يتأول على أن المعنى : إنْ كنت أشقيتنا بالمعصية فامحها عنا بالمغفرة. ومعلوم أنّ الشقاء والسعادة والرزق والخلق والأجل لا يتغير شيء منها)، واتە: ئەبێ ئەوەش تەئویلبكەین و ئەم مانای بدەینێ: خوایە! ئەگەر بەهۆی ئەو گوناهانەوە كە كردوومانە بەدبەخت كردووین لەو گوناهانەمان خۆشببەو، چونكە كامەرانی و ناسۆری و رزق و ئەجەل بە هیچ جۆرێك گۆڕانیان بەسەردا نایەت!! ئێمەش ئەڵێین: دەی باشە بۆ ئەبێ هەر بەو باردا تەئویلی بكەین كە دەیان ئیشكال دروستئەكات، بەڵام بەم بارەی تردا تەئویلی ئەكەین كە هەموو ئەو ئیشكالانە چارەسەر ئەكات؟! سەیری كتێبی" روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني"، ئالووسی و هەروەها تەفسیرەكەی خۆشی بەناوی"البحر المحيط" ئایەتی ٣٧و ٣٨ی سورەتی الرعد..بكە .بۆ فەرموودەكەو ژیاننامەی جابری كوڕی عەبدولڵای كوڕی رینابی ئەنصاریش سەیری ( الطبقات الكبرى، محمد بن سعد بن منيع أبو عبدالله البصري الزهري، المحقق : إحسان عباس، الناشر:دار صادر – بيروت الطبعة : ١ – ١٩٦٨ م ، جەڵدی سێیەم، لاپەڕە: ٥٧٤.

دەی ئێمە ئەبێ تەئویلی ئەم قسەیە بكەین و بڵێین: مەبەستی ئەو صەحابە بەڕێزە ئەوەیە كە كەس نەئەتوانێ شتێك بخولقێنێ وەك خوا نە ئەتوانێ شتێك ئەنجام بدات لەم بوونەوەرەدا وەك خوا، بەڵگەهێنانەوەشی بە ئایەتی{ألا لـه الخلق والأمر} هەر ئەم مانایە هەڵدەگرێت، ئەگەر وانەبێ ئەوە ئەم قسەیە ئەچێت بەگژی دەیان ئایەت و حەدیسدا وەك لەسەرەوە باسمانكردو ناشبێت ئەو صەحابە بەڕێزە ئاگای لەو ئایەتانە نەبووبێت كە باس لە ئیرادەو كاری راستەقینەی عەبد ئەكەن.

نمونەیەكی تر: شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە ئەڵێ: قەزاو قەدەر دوو پلەیە:

## پلەی یەكەم (قەدەر) دووشتە:

(١) بڕوات وا بێت هەرچی عەبد بیكات خوا بە عیلمی ئەزەلی خۆی ئەیزانێت.

(٢) هەموو ئەو شتانەشی لە (لەوحولمەحفوز)دا تۆماركردووە.[1]

---

[1] بۆ زیاتر نزیككردنەوەی ئەم چەمكە لە زیهن – لەم نمونانە بڕوانە- : خوای گەورە هاتنی پێغەمبەری ئیسلامی لە تەوراتدا نووسیووەو سیفەت و كارو چالاكیەكانیشی باسكردووەو پاش چەند هەزار ساڵ دوای ئەوە پێغەمبەری ئیسلام دێتە بوون و ئەو سیفەت و كارو چالاكیانە ئەنجامئەدات، یان قورئان ئەو هەموو هەواڵە بۆ داهاتوو باسئەكات وەك" چارەنووسی بەنی ئیسرائیل، سەركەوتنی رۆم، شكستخواردنی جەمعی قورەیش، ...هتد"، خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا (٤) فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ أُولَاهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَنَا أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا خِلَالَ الدِّيَارِ وَكَانَ وَعْدًا مَفْعُولًا)، یان ئەفەرموێ: (الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٥٧) ، هەروەها ئەفەرموێ:( الم (١) غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ (٤) بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ (٥) ، هەروەها ئەفەرموێ: (أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُنْتَصِرٌ (٤٤) سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ)..هەموو ئەمانەش بەوشێوەیە روونەدەن كە خوا هەواڵیداوە، لەرووی عەقڵیشەوە ئەمە سەلماوە، بۆنمونە: چەندجار رێئەكەوێت كەلەخەودا رووداوێك

**پلەی دووهەم (قەزا)[1] کە ئەویش دوو شتە:**

**(١) بڕوات وابێت خوای گەورە هەرچی ویست ئەبێت و هەرچیشی نەویست نابێت.**

**(٢) فەرمانیشی بە عەبد کردووە کە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوابن، (نەهی)شی لێکردون گوناه بکەن، خوای گەورەش خوانساس‌و چاکەکارو پیاوی دادپەروەری خۆشئەوێت و کافرو بێ دینیشی خۆشناوێت ورازی نییە لێیان..**

**ئەمە وەك لە دواشەوە باسینەکەین ئەبێ بڵێین: مەبەستی ئیبن تەیمییە ئەوە نیە کە مادامێك هەموو شتێك نووسرابێت بۆ ئەم مرۆڤە ئەوە مرۆڤ ئیتر دەست و قاچ و ئیرادەی کۆت و زنجیرکراوەو ناتوانێت ئەو قەدەرانە بگۆڕێت لەخراپەوە بۆ چاك یان لەچاکەوە بۆ خراپ، بەڵکو راست ئەوەیە کە مرۆڤ کائینێکی خاوەن ئیرادەیەو وەك فریشتە یان ئەستێرەو هەسارەکان نیە بە کۆنترۆڵ ببرێنبەرێوە، بەڵکو خوا ئازادی کردووە لەسنوورێکداو ئەتوانێ چی بوێت بیکات و بیڵێت ئەگەر خوا ئیزن بدات و لەهەر شتێکیشدا خوا ئیزنی نەداو چەند ویستی ئەو شتەی بۆ نەچووەسەر ئەوە حیکمەتێکی تێدایەو ئەو بەرپرس نییە لەو شتە.**

**ئەگەر ئەم بابەتی قەزاو قەدەرە زۆر ورد بکەیتەوە ئەبینی بەدرێژایی مێژوو هەر لە دەوری ئەم دوو تەوەرە سووڕاوەتەوە: هەندێك تەئویلی ئەو ئایەت و حەدیس و ئیجتیهادانەیان کردووە کە باسی گۆڕینی قەدەرەکانیان تێدایە تا بیگونجێنن لەگەڵ ئەو ئایەت و حەدیس و ئیجتیهادانەدا کە باس لە نەگۆڕی قەدەرەکان ئەکەن، هەندێکی تر تەئویلی ئەو ئایەت و حەدیس و ئیجتیهادانەیان**

---

پیشان خۆت یان یەکێکی تر ئەدرێت و پاش ماوەیەك کتومت وەك خۆی لە ئەرزی واقیعدا ئەو شتە ئەبینرێتەوەو ئەبێتە جێگەی سەرنج و تێڕامان بۆخەڵکی.

[1] ئەم دوو وشەی(قەدەر)و(قەزایە)لەرستەکانی ئیبن تەیمییەدا نین، بەلام من بۆ زیادە تێگەیشتنی خوێنەر دامناون، چونکە لەراستیدا ئەو دوو وشەیە پێویستە هەبن.

کردووە کە باسی نەگۆڕی قەدەرەکانیان تێدایە تا بیگونجێنن لەگەڵ ئەو ئایەت و حەدیس و ئیجتیهادانەدا کە باس لە گۆڕین و ئیمکانی گۆڕینی قەدەرەکان ئەکەن. ئێمەش لەم نامیلکە بچوکەدا هەر هەمان کارمان کردووەو ئەوەمان وتووە کە گونجاوە لەگەڵ دادی خواو رۆحی شەریعەت و ئایەت و حەدیس و قسەی ئەصحاب و تابیعینە بەڕێزەکان و زانا گەورەکانی ئیسلام و عەقڵی ساغ و سەلیمدا.

## ئیمان بەقەدەرو قەزا بریتییە لە چەند بڕگەیەك:

## بڕگەی یەکەم:

بڕوابوون بە بوونی ئیرادە جیاوازەکان لەم دونیایەدا:

- ئیرادەی خوا"جل جلاله": (انَّ اللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ).بەدڵنیاییەوە خوا هەر بڕیارێکی بوێت ئەیدات.
- ئیرادەی مرۆڤ :( بَلْ يُرِيدُ الْإِنْسَانُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُ (٥)، مرۆڤ ئەیەوێت لەپێشیەوە خراپەکاری بکرێت، یان (مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا (٧٩).هەر شتێکی باش روویدات لێت ئەوە لەخواوە بۆت هاتووەو هەرلێقەومانێکیشت لێڕوویدات ئەوە لەخۆتەوە هاتووەو تۆشمان ناردووە بۆ لای خەڵکی و ئەوەندەش بەسە کە خوا شایەت بێت.
- ئیرادەی شەیتان: (إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ).شەیتان ئەیەوێت کە دوژمنایەتی و ڕق و کینە بخاتە نێوانتان بەهۆی مەیخواردنەوەو قومارەوەو بەرتان لێبگرێت لەیادکردنی خواو نوێژکردن، ئایا ئێوە وازئەهێنن؟

○ ئیرادەی پەری: ( وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا (٨) وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَنْ يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَصَدًا (٩) وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَنْ فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا (١٠) وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَلِكَ كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا (١١) وَأَنَّا ظَنَنَّا أَنْ لَنْ نُعْجِزَ اللَّهَ فِي الْأَرْضِ وَلَنْ نُعْجِزَهُ هَرَبًا (١٢) وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَى آمَنَّا بِهِ فَمَنْ يُؤْمِنْ بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا). ئێمە پێشتر نەگەیشتینە ئاسمان و ئێستە ئەبینین پڕبووە لە پاسەوان و برووسکە، ئێمە پێشتر شوێنی تایبەتمان لێئەگرت بۆ گوێهەڵخستن و ئێستا هەرکەس گوێهەڵبخات ئەوە هەرزوو ئەدرێتە بەر برووسکە، ئێمە نازانین ویستی خراپە بەوکەسانە هەیە لە زەویدان یان پەروەردگاریان ئەیەوێ پێیانبگەیەنێت، ئێمە کەسی چاکمان تێدا هەیەو کەسانی تریشمان تێدایە لەخوار ئەوانەوەن، ئێمە پێشتر چەندین ڕێبازمان هەبوو، ئێمە بڕوامان وایە کە کەس لەم زەمینەدا لەدەستی خوا دەرناچێت و کەسیش ناتوانێت لێی ڕابکات، ئێمە گوێمان گرت بۆ بەرچاوڕوونیەك و بڕوامان پێیهێنا، بۆیە دڵنیاین لەوەی هەرکەس ئیمان بهێنێت ئەوە نە لەوە ترسی هەیە سەرمایەکەی بەکەم بۆ حسێب بکرێت و نەترسی ئەوەشی هەیە ستەمی لێبکرێت.

## بڕگەی دووەم :

## ئیرادە کە ڕووئەکاتە کارێك لەم دونیایەدا سێ حاڵەتی هەیە :

١- ئیرادەی خوا بەتەنیا لەکارێکدا.

٢- ئیرادەی عەبد بەتەنیایی لەکارێکدا.

٣- ئیرادەی خواو ئیرادەی عەبد کەیەکئەگرنەوە لەکارێکدا..

"موعتەزیلەکان"نکولی لە دەخالـەتی ئـیرادەو قـودرەتی خـوا ئەکـەن لـە کـاری عەبددا، چونکە ئەوە بە زەوتکردنی ئازادی عەبد ئەزانن، "جەبریەکان"یش نکولی لەئیرادەو قودرەتی عەبد ئەکەن لەکاری خۆیدا، چونکە ئەوە بە یاخیبوونی عەبـدو دەستەوسانی خوا ئەزانن، بەلاّم "ئەهلی سووننەت و جەماعەت" ئیرادەو قودرەتی عەبد لە لایەك و ئیرادەو قودرەتی خوا لە لایەك و ئـیرادەو قـودرەتی هاوکـات بـۆ خواو بۆ مرۆڤ و پەری و شـەیتانیش ئەسـەلەمێنن و ئـەوە نەبـەیاخیبوونی عەبـد ئەزانن و نەبەزەوتکردنی ئازادی عەبد ئەزانن[1]، هەرچـەندە هەنـدێ لـەزانایان بـۆ

---

[1] مەولەوی دانا لەم باسی ئیرادەدا ئەفەرموێ:

مسند الى الذات بوجه الايجاب

وەکو ئیرادەی خالیقی وەهاب

دەگەل موستەنید(الى غیر الذات)

وەك ئیرادەی تۆ، کێ فەرقی ئەکات

بە بێ ئیختیار هەردووی هەردوو هەس

حدووث و قیدەم بەبینیانەو بەس

لەو سیفەتەدا بێ ئیختیارن

لە ئەفعالدا هەردوو موختارن

بەلێ بۆ هەریەك وەسفێ موناسیب

موختاری خالیق، موختاری کاسیب

بەکورتی یانی: ئەو ئیرادەیەی ئەدرێتە پاڵ خوا هەر ئەو ئیرادەیە کەئەدرێتە پاڵ تۆی بەشەر، تەنیا یەك جیاوازییان هەیە ئەویش ئەوەیە: ئەوەی تۆ حادیسەو ئەوەی خوا قەدیمە.. خواو بەندەش لە ئیرادەکەدا ناموختارن (ئـەوەی خـوا مەعلومەو ئەوەی بەندەش راستیەکەی ئەوەیە کەخوا مرۆڤی وا دروستکردووە کەخاوەن ئیرادەبێـت و مـرۆڤ لـەوەدا ناموختارەو ناتوانێ بلێ: خوایە بۆ راتکردووە کە من مەخلوقێکی خـاوەن ئـیرادەم، بـۆ وەك دارو بـەردو ئاسـمان و زەمین دروستت نەکردم کە خاوەنی ئیرادەو ئیختیار نین)، بەلاّم لە کارەکەدا موختـارن، بـۆ خـوا ئـەوترێت خـالیقی کردەوەکانە، بەلاّم بۆ عەبد ئەوترێت کاسـیبی کردەوەکانـە، خـوای گـەورە بـێ قەیـدو شـەرت موختـارو خـالیقی کردەوەکانەو بەندەش بێ قەیدو شەرت موختارو کاسیبی کردەوەکانە، بەهەرحاڵ ئێمە ناچینەناو ئەو گێژداوەی کـە زانایان -بەتایبەتی زانایانی کەلام- دروستیانکردووە دەربارەی: خەلقی ئەفعال و کەسبی ئەفعال و ئەواروەدو ئیشتراك

چارەسەری ئەم ئیشکالە بیرۆکەی "ئیزن" ئەهێننە ناو مەسەلەکەو ئەڵێن: عەبد ئازادەو ئیرادەو قودرەتی سەربەخۆی خۆی هەیە ئەگەر خوا ئیزنی بدات ئەو کەسە کاریگەری ئەبێت و ئەتوانێ هەم سوود بگەیەنێت و هەم زەرەر بگەیەنێت، و ئەو کاتە کە خوا ئیزنی دا بەو عەبدە ئیتر لەسەر ئەو کارە چاکەی کەئەیکات پاداشتی ئەداتەوەو لەسەر ئەو کارە خراپەش کەئەیکات لێپرسینەوەی لەگەڵدا ئەکات، ئەگەر ئیرادەو قودرەتی خۆشی خستەکار بۆ کارێك چاك بێت یان خراپ بێت، بەلاّم خوا ئیزنی نەداو کارەکە پەکی کەوت، ئەوە ئەو عەبدە هیچ لۆمەیەکی لەسەر نابێ کەچاکەکەی نەکردووە، هەروەها هیچ لۆمەیەکیشی لەسەر نییە کەئەو خراپەی

---

و ئیجباری ئیرادی و ئیختیاری کرداری و...هتد، کە لەراستیدا ئەو زانایانە هەر ئەوەندەیان وردبکردایەتەوە کە وەحدانییەتی خوا لە زات و لەسیفات و لە ئەفعالدا هەموو وەك یەکن، ئەوە تووشی ئەو هەموو رۆچوونە نەئەبوون، بەسە کە هیچ عاقڵێك ناڵێ مانای وەحدانییەتی خوا لەزات و سیفاتدا ئەوەیە کە هیچ زات و هیچ سیفاتێکی تر جگە لەخوا نیە لەم بوونەدا، چونکە ئەم قسەیە نکوڵی لەبوونی ژیان و ئینسان و دارو بەردو ئاژەڵ و...ئەوانە گشتی ئەکات، دەی خۆ کەسەیری واقیع ئەکەی ئەبینی جگە لەخوای پڕکەماڵ ئەم بەشەرە نوقسانەو ئەم هەمووە گیاندارو بێگیانەش هەن و هەریەکەشیان خاوەنی کۆمەڵێك سیفەتی تایبەتن بەخۆیان، بۆیە راستی مەسەلەکە ئەوەیە کە زاتێك وەك زاتی خوا یان سیفەتێك وەك سیفاتی خوا نییە کە ئەزەلی و ئەبەدی و بێ کەموکوڕی بێت، ئەگینا زاتی تر کە سیفەتی تایبەت بەخۆیان هەبێت زۆرو زەبەندەن.. بۆ تەوحیدی ئەفعالیش پێویستە هەروا بڵێین: کەخوای پەروەردگار کاری خۆی هەیەو مەخلوقاتیش کاری خۆیان هەیە، بەلاّم نەك وەك کارەکانی خوا، کە پڕن لەدادو حیکمەت و زانست و سۆز، لەنەبوون ئیجادینەکات، بێحەددو حیساب مەخلوقات ئەخولقێنێ، چارەڕوانی هاوکارو هاریکار ناکات، لەداهاتوویان ناترسێت و..بەو شێوەیە، بەلاّم مرۆڤ وانیەو کارەکانی لەکاری خوا ناچن، یان دادی تێدا نیە یان حیکمەت یان زانستی تێدا نیە یان سۆز، یان لەداهاتووەکانی ئەترسن یان لەسنووری زەمەلکان دەرناچن...! لەراستیشدا ئەو جیاوازی و شەڕەقسانەی ناو زانایان زیاتر لەغزی و فەلسەفی و ئەزەرین نەك زانستی و شەرعی و عەمەلی، ئەوەش بەسە کە خوای گەورە هەم ئیرادەو هەم کارو هەم کاریگەری راستەقینەی بۆ خۆی و بۆ مرۆڤ و بۆ پەری و شەیتان سەلماندووە، ئەو ئیفرات و تەفریتەی هەندێ لەزانایانیش زیان بەساق و سازگاری عەقیدەی ئیسلامی لەبیرو لەدڵەکاندا ئەگەیەنێت و خۆبەدوورگرتن لەو گرێکوێرانە بۆ دین و بۆدونیاش مایەی سەلامەتیە، بۆ زانیاری زیاتر سەیری کتێبی "المختار من کنوز السنة النبوية، د.محمد عبدالله الدراز، ص٢١٦ تا٢٨٦بکە.

نەکردووە[١]، قورئان لە زۆر ئایەتدا ئەم "بیرۆکەی ئیزن"ەی باسکردووەو لەڕاستیدا چەمکێکی زۆر گرنگەو ئیشکالی زۆر چارەسەرنەکات بۆ مرۆڤ لەم پرسی قەدەرو قەزایەدا، بەهەمان شێوەش بیرۆکەی"اردت، اردنا، اراد الله" کە خوای گەورە لە قورئاندا باسیکردووە لەسەر زمانی (خەزیر)(سەلامی خوای لێبێت)وەك ئەفەرموێت: (فَأَرَدْتُ أَنْ أَعِيبَهَا)، (فَأَرَدْنَا أَنْ يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِنْهُ زَكَاةً)، (فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا)..

**بڕگەی سێیەم:** قەدەرو قەزایش تابیعی ئەم (ئیرادە)انەیەو ئەبێتە سێ بەش:

یەك: قەزاو قەدەرێك کە پەیوەندی بە عەبدەوە نیەو موحاسەبەی ناکرێت لەسەری وەك (دروستکردنی خۆی، ڕەگەزی، باوك و دایکی، ڕووداوە سروشتیەکانی ئەم بوونەوەرە، ئیش‌و کاری لەش‌و ئەندامەکانی ناوی، ..وهتد )، چونکە لەڕاستیدا مرۆڤ هیچ ئیرادەو دەخالەتێکی نیە تێیاندا.

دوو: قەزاو قەدەرێك کە تەنیا عەبدەکە خۆی ئەیکات-هەرچەندە ئیزنی خوای لەسەرە- لەبەرئەوە خواش موحاسەبەی ئەکات، وەك هەڵبژاردنی دینی ڕاست یان بێدینی، نەفس بەرەڵاکردن یان پەروەردەکردنی، گوناهکردن یان عیبادەتکردن.. هتد.

---

[١] هەرچەندە خوای گەورە لەرووی لوتفی زۆری خۆیەوە نیازکردنی چاکە بەچاکە بۆ مرۆڤ ئەنووسێ با خوا ئیزنی کردنەکەشی پێنەدات، هەروەها نیازکردنی خراپەی بەخراپە بۆ نانووسێ با ئیزنی کردنەکەشی نەدات، نەك هەر ئەوە-بەڵکو هەرلەو لوتفە زۆرەی خۆیەوەیەتی-کە ئەگەر ئەو کەسەی نیازی خراپە ئەکات و نایکات خوا ئەو ئیرادەی نەکردنەی بە چاکە بۆ ئەنووسێ وەك پێغەمبەر(صلى الله عليه‌واله‌وسلم) ئەفەرموێ: {إذا همّ العبدُ بحسنةٍ كُتبت لهُ حسنةٌ فإن عملها كُتبت لهُ عشرُ حسناتٍ. وإذا همّ بسيّئةٍ لم تُكتب عليه فإن عملها كُتبت عليه سيّئةٌ واحدةٌ وإن تركها لله كُتبت حسنةً}.

لەبەر ئەوە خوا بەزۆر کەس لە دین لانادات و بەزۆر کەسیش ناخاتەسەر دینی ئیسلام وەك ئەفەرمویّت:﴿ولو شاء الله لجمعهم علی الهدی﴾، ئەگەر خوا بیویستایە هەمووی خەلکی بەجارێك هیدایەتئەداو شارەزای ئەکردن لەدینەدا، ﴿أفأنت تكره الناس حتى يكونوا مؤمنين﴾، ئایا تۆ زۆر لەخەلکی ئەکەی تا ببنە ئیماندار، ﴿فمن شاء فليؤمن و من شاء فليكفر﴾جا هەرکەس ئەیەوێت با ئیمان بهێنێت و هەرکەسیش ئەیەوێ با کافر ببێت، ﴿قد افلح من زكاها و قد خاب من دساها﴾، هەرکەس دەروونی خۆی پاکبکاتەوە ئەوە سەرکەوتووەو هەرکەسیش دەروونی خۆی پشتگوێ بخات و پاکی نەکاتەوە ئەوە خۆی زەرەر ئەکات.

سێ: قەزاو قەدەرێك کە هەندێکی پەیوەندە بەخواوەو هەندێکیشی پەیوەندە بە عەبدەوە:

أ-ئەوەی پەیوەندە بەخواوە عەبد لەبەر ئەوەی ئیرادەو ویستی تێیدا نییە موحاسەبەی ناکرێت، بەلاّم ئەو بەشەی کە پەیوەندە بە عەبدەوە موحاسەبە ئەکرێت لەسەری ئەگەر بە ئەرکی خۆی هەلّنەسێت بۆ نمونە: نەخۆشکەوتنی عەبد یان تووشی موسیبەت و لێقەومانێك ئەبێت بە قەدەرو قەزای خوا، ئەو کاتە ئەرکی عەبد ئەوەیە تێبکۆشێ لە بەرانبەر ئەو موسیبەتەدا-و بیگۆرێت ئەگەر لەو شتانە بور کەقابیلی گۆڕین بوون-، یان ئارام و سەبر بگرێت لەسەر موسیبەتەکەو بەرازی بوونو تەسلیمبوون ڕووبەڕووی ببێتەوە- ئەگەر لەو شتانەبوو کە قابیلی گۆڕین نەبوو-.

ب-کەواتە قەزاو قەدەر لەتەنیا ئایەتێك یان لە فەرموودەیەك فەهم ناکرێت، بەلکو ئەبێت لەهەموو ئەو ئایەتو فەرمودانەوە فەهم بکرێت کە لەو بابەدا هاتوون. چونکە هەندێ ئایەت و حەدیس تەنیا باسی ئیرادەی خوا ئەکەن، هەندێکی تریان

تەنیا باسی ئیرادەی عەبد ئەکەن، هەندێ ئایەت و حەدیسیش باس لە ئیرادەی عەبدو خواش ئەکەن:

• بۆنمونە خوای پەروەردگار کەئەفەرموێت: ﴿فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر..﴾، هەرکەس ئەیەوێت با ئیمان بهێنێت و هەرکەسیش ئەیەوێت باکافر ببێت، کەواتە بەڕاستی مرۆڤ ئیرادە بەدەستی خۆیەتی لەم هەڵبژاردنەدا، خوا ڕاستنەکات لەگەڵ عەبدداو نایخەڵەتێنێ و بفەرموێت ئەتوانێ ئەوە بکات و کەچی نەشتوانێت!!

یان کەئەفەرموێ: ﴿ان الله لا يغير مابقوم حتى يغيروا مابأنفسهم﴾ کەواتە: گۆڕانکاری لەدەست مرۆڤدایەو ئەتوانێت هەلومەرجێك کە بەدڵی نییە بیگۆڕێت بۆ بارێك کە بەدڵیەتی!!

• پێغەمبەریش(صلى الله عليه واله وسلم) لەم مانایانەدایە کەبەکابرای فەرموو: (احرص على ماينفعك ولا تعجز) وەك لەکتێبەکانی(السنن)دا هاتووە: پێغەمبەر شەرعی دوو کەسی ئەکرد، ئەو کابرای کە حوکمەکەی نەبردەوە کاتێك کە پشتیهەڵکرد وتی: "حَسْبِيَ اللّٰهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ"، پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) فەرمووی:"إِنَّ اللّٰهَ تَعالى يَلُومُ على العَجْزِ، وَلَكِنْ عَلَيْكَ بالكَيْسِ فإذَا غَلَبَكَ أمْرٌ فَقُلْ حَسْبِيَ اللّٰهُ ونِعْمَ الوَكِيلُ " .واتە: خوا لۆمەی کەسی دەسەوسان ئەکات، تۆش ئەرکی سەرشانتە کە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتدا بکەیت، ئەگەر شتێکیش دەستی لێکردیتەوە (وچارت نەئەکرد) ئەوە بڵێ: خوام بەسەو هەر خواش باشترین بریکارە..

- حەزرەتی عومەر(رەزای خوای لێبێت) ئەفەرموێت: ( نفر من قدر الى قدر)[1] لە قەدەرێكەوە رائەكەین بۆ قەدەرێكی تر.
- شێخ عبدالقاری گەیلانیش(بە رەحمەت بێت) ئەفەرموێت: ( العارف من ينازع القدر لا من يوافق القدر)[2]، واتە: خواناسی راستەقینە زۆران ئەگرێت لەگەڵ قەدەردا نەك تەسلیمی ببێت.
- لەصەلاحەدینی ئەیوبیشەوە ئەگێرنەوە كە فەرموویەتی: "نازعت اقدار الحق بالحق للحق، فالرجل هو المنازع للقدر لا الموافق له"[3]، واتە: زۆرانبازی و كێشمەكێشیم ئەكرد بەهەق و لەبەر خاتری هەق لەگەڵ قەدەرە راستەكاندا، چونكە پیاوی راستەقینە ئەوەیە كە شەڕ لەگەڵ قەدەردا بكات نەك تەسلیمی ببێت.

ج-هەروەها قورئان دوو جۆر(ئەنجام)باستەكات كەبریتین لە"هیدایەت و گومڕابوون" كە پەیوەندن بە سەرەتاكانیانەوە بۆ نمونە:

- خوا كەس لەخۆڕایی هیدایەت نادات و كەسیش گومڕا ناكات لەخۆڕایی، بەڵكو ئەفەرموێت: ( فلما زاغوا ازاغ الله قلوبهم)، (لعن الذين كفروا من بنى

---

[1] لە صەحیحی بوخاری و لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتووە كە كاتێك ئیمامی عومەر لە رێگەدا گەڕایەوەو نەڕۆیشتە ئەو شارەی كە تاعونی تێدا بڵاوبووبوویەوە، ئەبو عوبەیدە رەخنەی لەو هەڵوێستەی گرت و فەرمووی:( أفِرَارًا مِنْ قَدَرِ الله ؟ فَقَالَ عُمَرُ : لَوْ غَيْرُكَ قَالَهَا يَا أَبَا عُبَيْدَةَ ، نَعَمْ نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ الله إِلَى قَدَرِ الله ، أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ إِبِلٌ هَبَطَتْ وَادِيًا لَهُ عُدْوَتَانِ إِحْدَاهُمَا خَصِبَةٌ ، وَالأُخْرَى جَدْبَةٌ ، أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الخَصْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ الله ، وَإِنْ رَعَيْتَ الجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ الله ، فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ، وَكَانَ مُتَغَيِّبًا فِي بَعْضِ حَاجَتِهِ فَقَالَ : إِنَّ عِنْدِي فِي هَذَا عِلْمًا سَمِعْتُ رَسُولَ الله يَقُولُ : إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ ، قَالَ : فَحَمِدَ الله عُمَرُ ثُمَّ انْصَرَفَ ) (البخاري : كتاب الطب / باب ما يذكر في الطاعون ، ومسلم : كتاب السلام / باب الطاعون والطيرة) .

[2] سەیری كتێبی "المنطلق"ی محمد احمد الراشد بكە.

[3] هكذا ظهر جيل صلاح الدين، ماجد عرسان الكيلان، ط ١٩٩٥، ص٢٤٤.

اسرائيل على لسان داود وعيسى ابن مريم ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون كانوا لايتناهون عن منكر فعلوه لبئس ماكانوا يفعلون)،(إن الله لا يهدي القوم الظالين)،(كذلك يطبع الله على قلب كل متكبر جبار)،(و كذالك نطبع على قلوب الذين لا يعلمون).

- هەروەها بۆ هیدایەتیش هەروایە وەك ئەفەرموێت:(ومن يؤمن بالله يهد قلبه)، (والذين اهتدوا زادهم هدى وآتهم تقواهم)،(ومن يعتصم بالله فقد هدي الى صراط مستقيم)،(والذين جاهدوا فينا لنهدينم سبلنا).
- بۆ خێرو شەڕیش بەگشتی ئەفەرموێ:(فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى (٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى (٦) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى (٧) وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى (٩) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى (١٠)..

کەواتە: چ هیدایەت و چ وێڵبوون پەیوەندییان بە عەبدەکە خۆیەوە هەیەو ئەنجامەکە لەسەر هەڵسوکەوتی ئەو عەبدە ڕانەوەستێت وەك ئایەتەکان بە روونی باسیئەکەن.[1]

---

[1] هیدایەت لە زمانی قورئاندا بە سێ مانای سەرەکی دێت(ڕامهێنان، شارەزاکردن، دلگۆڕین):

- هیدایەت ئەگەر بۆ خەڵکی یان بۆ ئاژەڵ و خولقاوەکانی تر بەکاربرا، ئەوە بریتییە لە رامهێنان و بەرمەجەکردنیان لەسەر ژیان، وەك ئەفەرموێ: (رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى)، یانی پەروەردگاری ئێمە هەموو پێداویستیەکی داوە بەخولقاوەکانی خۆی و پاشان ڕێگەی ژیانیشی بۆ ڕۆشنکردوونەتەوە.(واتە: فێریکردوون چۆن ئەرکی خۆیان لەژیاندا ئەنجامبدەن و جوان بژین و نەوە بخەنەوەو بیانپارێزن و بەردەوامی بەژیان بدەن لەو نەوەڵەی خۆیانەوە).
- ئەگەر بۆ پێغەمبەران یان بانگخوازان بەکاربرا ئەوە ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەو شارەزاکردنیانە لەڕێگەی ڕاستدا، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَهُدُوا إِلَى الطَّيِّبِ مِنَ الْقَوْلِ وَهُدُوا إِلَى صِرَاطِ الْحَمِيدِ (٢٤)الحج، واتە ڕێگەیان بۆ ڕۆشنکرایەوەو شارەزاکران لە قسەی پاکداو شارەزاکران لە ڕێگەیەکی سوپاسگوزاردا ، یان ئەفەرموێ: (وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (٥٢) صِرَاطِ اللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ) الشورى/٥٢، واتە:

● پێغەمبەریش(صلی الله علیه والەوسلم) باسی چۆنێتی ڕەشبوونەوەی دڵ ئەکات بەگوناه تاتەگاتە ئەوەی(مۆر)ی لێئەدرێتو لەڕەحمەتی خوا دەرئەکرێت و ئیتر ئیزنی ئیمانهێنانیشی پێنادرێت، ئایەت و فەرموودەیەکی زۆر لەو بارەیەوە هەیە وەك لای موسڵمانی خوێندەوار مەعلومە.

**بڕگەی چوارەم:** مرۆڤ هەرچەندە خاوەنی ئیرادەی تایبەتی خۆیەتی و ئازادە لەمومارەسەکردنی ئەو ئیرادانەداو خاوەنی کاروئیشی خۆیەتی و چی ویست ئەتوانێ نەخشەی بۆ دابنێت و ئەو ئیمکاناتەی خوا پێیداوە بەکاری بهێنێت بۆ ئەوەی پێیبگاتە ئەو ئامانجانەی هەیەتی لەو نەخشانەدا، بەلام نابێ بێمننەت بێت لەخوا، چونکە کۆنترۆڵی هەموو شتەکانی تر لای خوایەو خوا ئیزن نەدات گەڵای درەختێك لەدار نابێتەوە، نەخۆشێك چاکنابێتەوە، منالێك لەدایك نابێت و زیان یان سوودێك ناگاتە هیچ کەسێك....و بەو شێوەیە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ:(قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ).. بلێ: من بۆ خۆیشم ناتوانم هیچ جۆرە سوودێك یان زیانێك دەستەبەر

---

بەدڵنیاییەوە تۆ شارەزایان ئەکەیت لە ڕێگەیەکی ڕاست کە بریتییە لە ڕێگەی خوا کە ئەوەی لە ئاسمان و زەمیندایە هەموو هەر هی ئەون.یان

● هیدایەت ئەگەر درایە لای خوای پەروەردگار ئەوە بەمانای تەوفیق و دڵگۆڕین و دەستگرتنی عەبد دێت لەلایەن خواوە، چ لەدونیادا بێت یان لەئاخیرەتدا بێت، وەك ئەفەرموێ:(إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ (٥٦)القصص، یانی: تۆ ناتوانی تەوفیقی ئەوانە بدەی کە خۆشتئەوێن و دڵیان بگۆڕی، بەڵکو ئەوە خوایە کە دڵی هەر کەسێك ئەگۆڕێت ئەگەر ویستی و هەرئەو ئەزانێ کێ شایستەیە بەو دڵگۆڕینە(ئەمە بۆ دونیا).. (بۆ ئاخیرەتیش) ئەفەرموێ:( احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ (٢٢) مِنْ دُونِ اللَّهِ فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ (٢٣) وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ (٢٤))الصافات، یان ئەفەرموێ:( وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَنْ يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ (٤) سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ )، محمد/٤و٥.

بکەم ئەگەر خوا نەیەوێت ئەوە ببێت، خۆ ئەگـەر نادیـارم بزانیایـە ئـەوە ئیشـی چاکی زۆرم ئەکردو هیچ نارەحەتییەکم بەسـەردا نەئەهات، من هیچ نیم تەوەنەبێت کە ترسێنەرو مژدەدەرم بۆ گەلێك کە بڕوابهێنن.

هەروەها ئەفەرموێ:(قُلِ ادْعُوا الَّـذِينَ زَعَمْـتُمْ مِـنْ دُونِ اللَّـهِ لَـا يَمْلِكُـونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِنْ شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُمْ مِـنْ ظَهِيرٍ)،بڵێ: هانا بۆ هەموو ئەوانەبەرن کە لەخوار خواوەن(کە ئێوە قەناعەتتان وایە فریاتان ئەکەون)، دڵنیـابن کـەخاوەنی تۆسـقاڵێکیش شـت نـین لـە ئاسمانـەکان و لەزەمینیشدا، شتێکی هاوبەشیشیان نیە لەو دوانەدا، و هیچ کەسـێکیش لەوانـە لەخواوە مافێکی لەوشێوەیان پێنەدراوە..کەواتە نەڕاستەوخۆو نەناڕاستەوخۆ کەس هیچی پێناکرێـت ئەگـەر خـوا ئیزنـی گرتـەوە، نەئـەتوانێ زیانێـك بگەیـەنێت و نەئەتوانێ قازانجێك بگەیەنێت..

لەبەر ئەمانە پێویستە عەبد کە ژن ئـەهێنێ بڵـێ: خوایـە! ئـەوە مـن وەك تـۆ فـەرمانت کـردووە ژنمهێنـا، دەی تـۆش منـاڵم پێببەخشـە، ئـەوە مـن وەك تـۆ فەرمانتکردووە چارەسـەرم بۆ نەخۆشیەکەم بەکارهێنا، تۆش شیفام بۆ بنێـرە، مـن ئەوە دەستمدایە کاسبیکردن، تـۆش رزقـی حـەڵاڵم بـۆ ئاسـانبکە، مـن وەك تـۆ فەرمانتکردووە دەستم بەخوێندن کردووە، تـۆش زیرەکـی و تێگەیشـتنی جـوان و دروستم پێ بدە، من وەك چۆن تۆ فەرمانتکردووە بەرنامـەم بـۆ کارەکـانم دانـاوە، تۆش پشتیوانیم بکە سەربگرن و کارئاسانیم بۆ بکەو گرفت و کەموکورتیەکانیم بۆ چارەسەر بکە..و بەوشێوەیە، ئەم ترس و ئومێدو ئەم قەناعەت و دوعاکردنە لەبەر چەند راستیەکە:

١-ئەو عەبدە چەند بیەوێت بەرنامەیەك دابنێ و كاری بۆ بكات لەراستیدا ئەگەر خوا ئیزنی نەدات-لەبەر هەر حیكمەتێك بێت- ئەوە بۆی ناچێتەسەر، با دەستەبەری هەموو كەرەسەیەكیشی كردبێت بۆ ئەو كارە، خوای گەورە لەسوورەتی ئەلكەهفدا ئەفەرموێ: (وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا (٢٣) إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ وَاذْكُرْ رَبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰ أَنْ يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا)، بە هیچ شتێك مەڵێ بەیانی ئەوە ئەكەم تا نەڵێی: ئەگەر خوا ویستی وابوو، ئەگەر ئەمەشت بیرچوو ئەوە یادی خوا بكەو بڵێ: بەڵكو خوا رێگەم بۆ رۆشنبكاتەوەو لەتێربوون و پێگەیشتن نزیكم بكاتەوە، (وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا)، ئێوە ناتوانن ویستی هیچ بكەن كاتێك نەبێت كە خوا ویست بكات، ئەو خوایە زاناو دانایە..خوای گەورە نیگایكرد بۆ داوود پێغەمبەر(علیە السلام)و پێی وت: (یا داوود انت ترید و انا أرید ولا یكون إلا ما أرید، فإن سلمت لي ما أرید أتیتك بما ترید وإن لم تسلم لي ما أرید أتعبتك فیما ترید ولا یكون ألا ما أرید[١]. ئەی داوود! تۆ ویستی شت ئەكەیت و منیش ویستی شت ئەكەم و لەوەش دڵنیابە كە ئەوەی من ویستی ئەكەم نابێت، ئەگەر ئەوەی من ئەمەوێت بۆمی بكەی ئەوە منیش بەو شتانەوە دێم بۆ لای تۆ كە تۆ ئەتەوێن، خۆ ئەگەر ئەوەم بۆ نەكەی كەمن ئەمەوێ ئەوە ماندووت ئەكەم لەو شتانەدا كە تۆ ئەتەوێن و دڵنیاشبە ئەوەی من ئەمەوێت نابێت.

چەند كەس هەیە گیرئەخوات بەدەست خۆیەوە، یان بەدەست منالێكیەوە، یان بەدەست نەخۆشیێكەوە، یان بەدەست گرفتێكی هەر زۆر

---

[١] بڕوانە كتێبی: إیقاظ الهمم شرح متن الحكم، ابن عجیبة، http://www.alwarraq.com، هەروەها بڕوانە كتێبی: قوت القلوب، أبو طالب المكي.

بچوکەوەو تا ئەو کاتەی خوا ئیزن نەدات گرفتار ئەبێت و ناتوانێت تەکان بخوات بۆ پێشەوە، کە خواش ئیزنیداو رێگرەکە نەما ئەکەوێتە جوولەو نەشونما، کێ هەیە ئالێرەدا دەیان نمونەی بۆ ئەم بابەتە پێنەبێت!

٢-هەموو ئەو ئیمکاناتانەی لەبەر دەستیدایە ئەگەر خوا ئیزنیان پێنەدات کار بۆ ئەو کەسە ناکەن و دەستی لێنەکەنەوە، ولاخەکەی ژێری یان سەیارەکەی، منالەکانی خۆی یان کرێکارو خزمەتکارەکانی، بازارو کارگەو کۆمپانیاکانی، خەلك و کەش و هەواو ...هتد.(أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُنِيرٍ (٢٠). ئەوە بۆ وردنابنەوە لەوەی کە لەڕاستیدا خوا هەموو ئەو شتانەی لەئاسمانەکان و زەمیندا هەن بۆ ئێوەی ژێربار خستووەو کردوونی بەژێر نازونیعمەتی ئاشکراو پەنهانی خۆیەوە، کەچی هەندێ کەس دەمەدەمێ لەگەڵ خوادا ئەکات بەبێ زانیاری و بەبێ شارەزایی و بەبێ کتێبێکی رووناکی بەخش..

٣- عەقڵ و جەستەو ئەندامەکانی لەشی خۆی-دڵ و خوێن و رۆح و...- هەموو لەژێر کۆنترۆڵی خوادایە، ئەگەر خوا نەیەوێت، یان خوا ئیزنیان نەدات کاری بۆ بکەن ئەوە بەدڵنیاییەوە ئەو عەبدە پەکی ئەکەوێت و ناچارە کە چۆك دابدات، کابرا کە عەقڵی ئیشی نەکرد، یان جەستەی نەهات لەشوێنی یان ئازارو لاوازی دایە ئەندامێکی لەشی، چی پێئەکرێت کاتێك نەبێت کە خوا ئەو گرفتەی بۆ چارسەر ئەکات.. (الَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ (٧٩) وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ (٨٠)خوا ئەو پەروەردگارەیە کە خواردن و خواردنەوەم پێئەدات و کەکاتێکیش نەخۆشئەکەوم ئەو شیفام بۆ ئەنێرێت.

٤-عەبد هەموو شتێکی سنووردارەو خوای گەورەش هەموو شتێکی رەهایە، بۆیە خوای گەورە کە سەرچاوەی هەموو هێزو دەسەلات و کەمالێکە عەبد پێویستی پێی هەیە تا کەموکورتییەکانی بۆ تەواو و تێر بکات، بیپارێزێت لە فەوتان و لە چاوو دەستی دوژمن و زیاد لەپێشبینی و چاوەڕوانکردنی خۆیی پێبدات لەدونیاو لەئاخیرەتدا، خوای گەورە لە سورەتی ئەلبەقەرەدا ئەفەرموێ:(فَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ (٢٠٠) وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (٢٠١) أُولَئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِمَّا كَسَبُوا وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ (٢٠٢) هەندێ کەس هەیە ئەڵێت: خوایە!(تۆ)لەدنیادا باش بهێنە رێم، دەی ئەو کەسە هیچ پشکێکی لەئاخیرەتدا پێنادرێت، بەلام هی واش هەیە ئەڵێ: خوایە! لە دونیاو لە ئاخیرەتدا هەر باش بهێنە رێمان و لە سزای ئاگر بمانپارێزە، ئەوانە مافی خۆیانە کەپاداشتیان بدرێتەوە لەبەرانبەر ئەو کارانەدا کە کردوویانەو خواش بەخێرایی حسێبەکات..

٥-جاری وا هەیە کار لەسەرەتاوە بێگرێ و لەمپەر ئەڕوات بەلام لەنیوەیدا کێشەو گرێیەکی تێئەکەوێت یان پێش ئەوەی بگاتە کۆتایی لەمپەرێکی دێتەبەردەم و کارەکە پەکئەخات، بۆیە عەبد ئەبێ هەمیشە رووی لەخوا بێت تا هاوکاری بێت و کێشەو گرێکانی بۆ بکاتەوەو یارمەتی بدات کارەکانی بگەنە ئەنجام،" احْرِصْ على ما يَنْفَعُكَ، واسْتَعِنْ باللّهِ ولا تَعْجِزَنَّ"، ئەوانەی بڕوایان بەقەدەر نییە بەهیچ جۆرێك و بڕوایان وایە خوا دەخالەت لەکاری بوونەوەردا ئەکات بەلام دەخالەت لەکاری عەبددا ناکات پێویستە لەم خاڵە زۆر وردببنەوە کە: هۆی چییە عەبد ئەبێ هەمیشە دەم بەدوعابێت و داوای کۆمەك و هاوکاری بکات لە پەروەردگاری، داواکردن لە پەروردگار بۆ سەرەتاو بۆ میانەی کارو بۆ ئەنجامەکانیەتی، دوعا بۆ

ئەوەیە کە خوا سەرەتا بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و دەستی پێوەی بێت و کێشەکانی بۆ چارەسەر بکات لەدرێژایی ئەو کارانەداو سەرەنجامی باش و بەکەڵك بداتە ئەو کارانەی کە کردوونی.. ئەی "ایاك نستعین" یانی چی ئەگەر عەبد خۆی خاوەنی خۆی بێت و پێویستی بەخوا نەبێت و هەموو ئیرادەو ئیختیارەکان هەر لەلای خۆی بن؟!

کابرایەك هەبوو لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا موناقەشەی زۆری لەسەر ئەم قەزاو قەدەرە ئەکرد، پاش موناقەشەیەکی زۆر هاتە سەر ئەوەو پەیمانی دا هەرگیز ئیتر لەو مەسەلەیەدا قسە نەکات و خەلکی چەواشەنەکات، بەلاّم پاش مردنی عومەرو دروست لەسەردەمی هیشامی کوڕی عەبدولملیکدا دەستیدایەوە گومان دروستکردن دەربارەی قەزاو قەدەر، هیشامیش بانگیکردو پێی ووت: باشە تۆ پەیمانت نەدا کە ئیتر بە هیچ شێوەیەك قسە لەسەر ئەو مەسەلەیە نەکەی؟ وتی: ببوورن، سوێند بەخوا ئیتر هەرگیز دووبارەی ناکەمەوە! هیشامیش وتی: خوا نەمبورێ ئەگەر بتبوورم، تۆ سورەتی "الفاتحە"ت لەبەرە؟ وتی: بەڵێ، هیشام وتی: دەی بخوێنە! ئەویش دەستی کرد بەخوێندنی سورەتی فاتیحە تا گەیشتە "ایاك نعبد و ایاك نستعین"[١]، ووتی: بوەستە! داوای یارمەتی بۆ چ شتێك لێئەکەی، داوای شتێکی لێئەکەی کە بەدەست ئەوە(نەك تۆ)کەچی ناتوانێ بۆتی بکات؟! یان داوای شتێکی لێئەکەی کە بەدەست خۆتە(و منەتت بەئەو نیە)؟! بڕۆن ئەمە لەسێدارەبدەن[٢]، چونکە کابرا دەستی دابوویە گەمەکردن بە ئیسلام و

---

[١] واتە: ئێمە تەنیا هەر تۆ ئەپەرستین و تەنیا داوای یارمەتیش هەر لەتۆ ئەکەین.

[٢] بڕوانە کتێبی:( مرهم العلل المضلة في الرد على أئمة المعتزلة)، عبدالله بن أسعد بن علي اليافعي،ص١٣٤.

یاریکردن بەعەقڵی خەڵکی و نانــەوەی گەنـدەڵکاری بـەبێ سـڵکردنەوە لەیاســای گشتی دەوڵەت.

٦-چەند کەس هەیە ژن ئەهێنێ کەچی چەند هەوڵ ئەدات منداڵی نـابێ، یـان داوو دەرمانی دنیا بەکارئەهێنێت و چاك نابێتەوە، یان بەردەوام خەریکی کاسبیکردنەوە کەچی هــەر نـانی تـەواوی دەسـتناکەوێت، زۆر ئـەخوێنێت و کەچـی شـتێکی وا تێناگـات ، نەخشـەی دنیـا داتـەنێت و بـڕۆی ناچێتەسـەر، لەبەرانبـەر دوژمــن و ناحەزەکانیدا هــەموو ئامادەکاریـەك ئـەکات کەچـی هــەر سـەرکەوتن بەدەسـت ناهێنێت و لەدەسەلأت نزیك نابێتەوە، نزای زۆر ئەکات و کەچی لێیوەرناگیرێـت و قەدەرەکانی بۆ ناگۆڕرێت...و بەوشێوەیە، ئەمانە وانەکەن و فێرینەکەن کـە عەبـد نابێ بەوە فریو بخوات کە ئەو ئازادەو منەتی بەخوا نیەو دوعاکردن چەکی دەسـتی کەسی تەمەڵ و بێدەسەلأتەو ئەو خۆی چی ویست نەخشەی بۆ دائەنێت و بەدەستی ئەهێنێت، بەڵکو ئەبێ هاوڕێ لەگەڵ بەکارهێنانی هەموو هۆکارەکانیشـتدا بـەدڵ بڕوای وابێت کە ئەوشتانە خوا ئەیانکات و ئەو ئیزن نەدات ناگۆڕرێن و ئەرکی ئەم ئەوەیـە کـە-دوای دەسـەبەرکردنی هۆکارەکـان - ڕوویکاتـە پـەروەردگارو داوای لێبکات کارەکانی بۆ ئاسانبکات و لە تێکشکان و مایەپووچی بیپارێزێت..

٧-ئەگەر عەبد هەموو ئەو شتانەی کەپێویسـتە کردنـی کەچـی ئـەو ئەنجامانـەی دەستنەکەوت کە خۆی ئەیەوێت ئەوە بێئومێد نابێ و دڵتەنگی و کەئابـەی تـووش نابێت، چونکە ئەزانێ ئەوە خوایە کە ئیزنـی نـەداوە ئـەو شـتانە ڕووبـدەن لەبـەر هۆیەك یان زیاتر، بێگومان لەبەرژەوەندی ئەویشەو خوا ناحەز نیـە بەکـەس،خوای گەورە ئەفەرموێ:( عَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ)، ئەگونجێ ڕقتـان لەشـتێك بێـت کەچـی

خێربێت بۆتان و ئەشکونجێ شتێکتان خۆشبوێت و شەڕ بێت بۆتان!خوا ئەیزانێت و ئێوە نایزانن[1]، یانی ئەگەر ناردیە داوای چەند کەس و ئەو کارە ڕێنەکەوت یان دەستیدایە کارێك چەند جارو هەرنەهات بەدەستیەوە یان چەند چارەسەری بەکارهێناو چاکنەبوویەوە.. ئەوە لەوە دڵنیابێت کە خوا ئیزنی بەو شتانەنەداوە ڕوویدەن لەبەر هۆیەك یان زیاتر، ئەگەر نا خوای پەروەردگار ئەگەر بیەوێت ئەکچ و ئە باوك و کەس وکاری کچ ناتوانن ڕێگە لەوە بگرن و گفت نەدەن و "ئار"بدەن بەکوڕ، بەڵکو ئەگەر خوا ویستی خۆشیان نازانن چۆن کارەکە ڕێنەکەوێت و تەواونەبێت، یان نەخۆشەکە چۆن چاکنەبێتەوەو ئەچێتەوە سەرکارەکانی خۆی! یان کارە دینیی یان دنیاییەکان چۆن دێن بەدەستیەوە بەبێ خۆڕەنجدانێکی واش کە شایانی باس بێت..پێغەمبەر (صلی الله علیەوالەوسلم) ئەفەرموێ: "اللهم لا سهل إلا ما جعلته سهلا وأنت تجعل الحزن إذا شئت سهلا"[2]، خوایەئەوەی تۆ ئاسانی نەکەی ئاسان نابێت، تۆش کەویستت غەم و خەفەتیش ئاسان و سووك ئەکەیت لەسەر بەندەکانت.

هەرئەم قەناعەتەیە لە باوەڕداردا ئەبێتە هەوێنی ژیانی و سوکنایی بەدڵ و دەروونی ئەدات و ڕزگارینەکات لەدڵەتەپەو نائارامی، وایلێئەکات لەشەڕدا لەمردن هەڵنەیەت و لەهەڕەشەی ئەم یان ئەویتر نەترسێت و بڕوای وابێت کە تا

---

[1] شاعیرێك جوان ئەڵێت:

رب امر تتقيه............ فيه امر تبتغيه

خفي المحبوب منه............ وبدا المكروه فيه

[2] صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان، محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي، الناشر : مؤسسة الرسالة – بيروت، الطبعة الثانية ، ١٤١٤ – ١٩٩٣، تحقيق : شعيب الأرنؤوط، رقم الحديث: ٩٧٤، قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح .

خوا ئیزن نەدات هیچ خولقاوێك ناتوانێ هیچ بكات لێی، ئەگەر لەناو ڕێژمەی گوللەدا بێت یان لەناو شاری مارو مێروودا بێت یان لەناو سەربازگەی دوژمندا بێت، تاخوا ئیزن نەدات هیچی لێنایەت و تووشی هیچ نابێت، خوای گەورە ئەفەرموێ:( وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُؤَجَّلًا)، ڕێناكەوێت كەسێك بمرێت بەبێ ئیزنی خوا، ئەمە لەرووی نووسراوێكی دیاریكراوەوە ئەبێت، (مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ)، هیچ ڕووداوێك ڕوونادات بەئیزنی خوا نەبێت، هەركەس ئیمان بەخوا بهێنێت ئەوە خواش دڵی ڕۆشنئەكاتەوەو ئەیگۆڕێت و ڕووینەكاتە خۆی... ئەبوونی ئەم قەناعەتەشە خەڵكی دوور لەدین تووشی هەڵچوون و ترس و كەئابەو دڵەڕاوكە ئەكات و ژیانی لێتاریك ئەبێت و پەنا بۆ نائومێدی و خۆكوشتن ئەبات.. خوای گەورە فەلسەفەی ئەم ئیمان بەقەدەرو قەناعەتە دینییە باسئەكات و ئەفەرموێ:(مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٢٢) لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (٢٣).. لێقەومانێك نییە لە زەمیندا یان لەدەروونی ئێوەدا ڕووبدات و پێشتر لە دەفتەرێكدا نەمانووسیبێت ئەمە بۆ خوا ئاسان و سانایە* ئەمەش بۆ ئەوەیە كە خەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی لەدەستتان دەرچووەو دڵخۆش و سەرگەرمیش نەبن بەوەی پێتاندراوە، خواش كەسی بەفیزو خۆهەڵكێشی خۆشناوێت... یانی ئەوەی كە شتێكی لەدەستچووە، بەو بڕوابوونەی ئیتر غەمبار نابێت و تێئەگات ئەوە خوایە نەیویستووە ئەو كارە ببێت و ئەم بەبڕیاری خوا ڕازییەو ئارامئەگرێت لەسەری تا بێ پاداشت نەبێت و ئیتر سەرلەنوێ ئەكەوێتەوە هەوڵدان، بەهەمان شێوە فیزو خۆهەڵكێشیش ناكات بەو

شتانەوە کە هەیەتی چونکە ئەزانێ ئەو شتانە هەموو هی ئەو پەروەردگارەن و هەرکاتێك ویستی یان ئەم لەماڵەکە ئەسەنێت یان ماڵەکە لەئەم ئەسەنێت!بۆیە نەبەنەبوون بێئومێد ئەبێت، نەبەبوونیش فریونەخوات و لووتنەکات بەئاسماندا!! بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە هەر ئەو ئەزانێت دەرمانی دڵ و دەروون و مێشکی ئەم مرۆڤە لەچیدایەو بەچی دائەمرکێتەوەو ناڕووخێت!!

پێغەمبەری خوا(صلی الله علیەوالەوسلم)چەند جوان ئەمە روونئەکاتەوەو ئەفەرموێ:" المُؤْمِنُ القَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إلى اللَّهِ تعالى مِنَ المُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وفي كُلٍّ خَيْرٌ، احْرِصْ على ما يَنْفَعُكَ، واسْتَعِنْ باللَّهِ ولا تَعْجِزَنَّ وإنْ أصابَكَ شيءٌ فَلاَ تَقُلْ:لوْ أني فَعَلْتُ كَذا كانَ كَذا وَكَذا،وَ لَكِنْ قُلْ قَدَّرَ اللَّهُ وَما شاء فَعَلَ،فإنَّ لَوْ"تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطانِ"[1] ، ئیمانداری بەهێز چاکترو خۆشەویستترە لای خوا لە ئیمانداری لاواز، هەمووشیان هەر خێردارن، پێدابگرەو سووربە-لەبەدەستهێنانی- ئەو شتانەدا کەسوودت پێئەگەیەنن، پشتیش بەخوا ببەستەو پشتوێنی لێمەکەرەوەو دەستەوسان لێیدابنیشی، ئەگەر شتێکیشت تووشبوو مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە ئەوە واو وا ئەبوو، بەڵکو بڵێ: خوا بەرنامەی بەوشێوەیە بوو، ئەوەشی خوا بیەوێت ئەیکات، لەراستیدا گوتەی"ئەگەر" دەرگای شەیتان ئەکاتەوە.

هەروەها پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم)لەم باسەدایە کەئەفەرموێ: «إن لكل شيء حقيقة وما بلغ عبد حقيقة الإيمان حتى يعلم أن ما أصابه لم يكن ليخطئه وما أخطأه لم يكن ليصيبه»[2] ، هەموو شتێك بارێکی راستەقینەی هەیە، کەسیش ناگاتە راستی ئیمان کاتێك نەبێت کە ئەگاتە ئەو قەناعەتەی کە ئەوەی

---

[1] الاذكار، للامام النووي.

[2] حديث أخرجه أحمد (٦/٤٤١، ٤٤٢) وابن أبي عاصم في السنّة (٢٤٦) وإسناده حسن.

تووشی بوودو ئەمی پێکاوە نەئەبوو هەڵەبکات و نەیپێکێت و ئەوەشی کەئەمی نەپێکاوەو لایداوە لێی نەئەبوو بیپێکێت و لێیبدات!

**بە کورتی دیدی ئەهلی ئیسلام لە قەزاو قەدەردا ئەوەیە کە:**

یەکەم: خوای گەورە ئیشی خۆی ئەکاتو عەبدیش ئیشی خۆی ئەکات کە خوا ئاگای لە هەموو هەیە، واجبی عەبد ئەوەیە کە(چی بکاتو چی نەکات) کاری خواش ئەوەیە کە(چی ئەبێتو چی نابێت)، ئینجیل لە حەزرەتی عیساوە"سەلامی خوای لێبێت" ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:"یا بني إسرائیل لا تقولوا:لم أمر ربنا؟ ولكن قولوا:بم أمر ربنا "، ئەوەکانی ئیسرائیل! مەڵێن: ئەوە پەروەردگار بۆ فەرمانی وا کردووە؟! بەڵکو بڵێن: پەروەردگار فەرمانی بەچی کردووە؟ راڤەکەری عەقیدەی تەحاوی دوای ئەم قسەیە ئەڵێ: هەر بۆیە پێشینەکانی ئەم ئوممەتە کە لەهەموو کەس کاملتر بوون لە زانست و لەعەقڵ و لە مەعریفەدا پرسیاریان لەپێغەمبەر(صلی الله علیه والەوسلم) نەئەکردو بڵێن:"لم أمر الله بكذا؟ ولم نهى عن كذا؟ ولم قدر كذا؟ ولم فعل كذا؟ لعلمهم أن ذلك مضاد للإيمان والاستسلام"[1]. لەڕاستیدا عەبد بۆی نییە دەخاڵەت لەئیشی خوادا بکاتو راشنەسپێراوە کەبوەستێت تابزانێت خوای پەروەردگار چی ئەکاتو چی ناکات، بەڵکو ئەبێت بە دوای کاری خۆیدا بڕواتو بزانێت (مامەڵە)ی خوای پەروەردگار بەپێی (مامەڵە)ی ئەمە لەگەڵ شەرعی خوادا.

هەر بۆیە:

---

[1] شرح الطحاوية في العقيدة السلفية، صدر الدين علي بن علي بن محمد بن أبي العز الحنفي، تحقيق أحمد محمد شاكر،ص٣٢٣.

أ- موسڵمانان فێرئەکات دەستبکەن تا ئەو قەدەرانەی حەزیان پێیەتی خۆشەو تەیانەوێت بۆیان بێنەدی. چونکە ئەگەر ئەو دوعانە کەمتکین ئەبێت خوا نێری عەبدی ناکات، یان نیەتی عەبد بیانکات، چونکە ئەگەر وا نەبێت ئەوە عەبەسییەتەو خواش دوورە لەوە کاتە بە عەبدی خۆی بکات. بەڵێ دەستبکەو کەچی ئەو دوعانە هیچ لە مەسەلەکانیش نەگۆڕن!

( رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (٢٨٦) هەر لەسووڕەتی ئەلبەقەرەدا ئەفەرموێ:( وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ (٦٠) پەروەردگاری ئێوە فەرموویەتی: هاوارم لێبکەن من دێم بەهاوارتانەوە، ئەو کەسانەی خۆلەوە بەگەورەتر ئەزانن کە عیبادەتی من بکەن ئەبێ بە ڕسواییەوە بچنە ناو جەهەننەم.

ب-ئەوەی بەدوای خێرو هیدایەتدا بگەڕێت قورئان و حەدیس بەئاماژەو بەراشکاوانەش دەریانبڕیوە کە خوا هیدایەتی ئەدات و تووشی خێریشی ئەکات(فَإِنْ أَسْلَمُوا فَقَدِ اهْتَدَوْا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ)( وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ)، ئەوەشی بەدوای شەڕو گومڕاییدا بگەڕێت ئەوە خوا تووشی شەڕو گومڕایی ئەکات وەك ئەفەرموێ:(فلما زاغوا ازاغ الله قلوبهم) کە لەدین خۆیان بەدوورگرت و لایاندا خواش دووری خستنەوەو لایدان، (لعن الذين كفروا من بنى اسرائيل على لسان داود وعيسى ابن مريم ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون كانوا لايتناهون عن منكر فعلوه لبئس ماكانوا يفعلون)، ئەفرینکرا لەکافرانی ناو ئەوەکانی ئیسرائیل لەسەر زمانی داوودو عیسای کوڕی

مەریەم ئەوەش لەبەر ئەو گوناهكردن و سنوورشكاندنەی خۆیان بوو، ئەوانە ڕێگرییان نەنەكرد لەو خراپەكاریانەی لەناویاندا ئەكرا، بێفەڕ كارێك كە دەستیان دابوویە، (إن الله لا يهدي القوم الظالين) خوا میللەتی ستەمكار بەرچاوڕۆشن و شارەزاناكات، (كذلك يطبع الله على قلب كل متكبر جبار)، ئابەوشێوەیە خوا مۆر ئەنێت بەدڵی هەموو كەسێكی لووتبەرزی ستەمكاردا، (و كذالك نطبع على قلوب الذين لا يعلمون) بەو شێوەیە مۆر ئەنێین بە دڵی هەموو ئەوانەی كە نایانەوێ فێری شت بن، هەروەها بۆهیدایەتیش ئەفەرموێت: (ومن يؤمن بالله يهدى قلبه) هەركەس ئیمان بەخوا بهێنێت ئەوە خواش دڵی ڕۆشننەكاتەوەو ئەیگۆڕێت و ڕووینەكاتە خوا،(والذين اهتدوا زادهم هدى وآتهم تقواهم) ئەوانەی بەدوای بەرچاورونی و شارەزابوون لە ئاییندا ئەگەڕێن خوا زیاتر بەرچاوڕوون و شارەزایان ئەكات لە ئاییندا، (ومن يعتصم بالله فقد هدي الى صراط مستقيم)، هەركەس دەست بەخواوە بگرێت ئەوە شارەزای ئەكەین لە ڕێگەیەكی ڕاست و ڕێكدا، (والذين جاهدوا فينا لنهدينم سبلنا) ئەوانەی تێدەكۆشن لەپێناوی ئێمەدا ئەوە ئێمەش شارەزاو بەرچاوڕۆشنیان ئەكەین لەهەموو ڕێگەكانی خۆماندا.

ج-عەبد فێرئەكات كە ئەگەر ئەنجامی ئەوێت ئەبێ ئەو ڕێگەو كەرەسانە بەكاربهێنێت كەئەو ئەنجامانەی پێبەدینەهێنرێت:بۆ نمونە: ئەگەر بەهەشتی ئەوێ ئەبێ عیبادەت بكات، ئەگەر منداڵی ئەوێ ئەبێ ژن بهێنێ، ئەگەر تێربوونی ئەوێ ئەبێ خواردن بخوات، ئەگەر زانایی ئەوێ ئەبێ بخوێنێت و ئەگەر دەوڵەمەندی ئەوێ ئەبێ كاسبی بكات و...بەو شێوەیە، بەڵام پێویستە ئەوەش بزانێت كە ئەبێ بڕوای بەخوا هەبێت و پشتی پێ ببەستێت بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئەنجامانە، چونكە ئەگەر

خوا ئیزن نەدات عەبد هەموو ئەو ڕێگەو کەرەسانەش بگرێتەبەر ئەو ئەنجامەی هەر دەست ناکەوێت کە ئەیەوێت، خوای گەورە ئەفەرموێت:

- (وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ)
- (كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ)
- (فَهَزَمُوهُمْ بِإِذْنِ اللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ)
- (فَأَنْفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللَّهِ)
- (مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ)
- (وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ)[1]

---

[1] ئەم ئایەتە مرۆڤی موسڵمان زۆر ڕائەگرێت و پرسیاری زۆری بۆ دروستئەکات، لەوانە: یانی چی عەبد بە ئیزنی خوا ئەبێ ئیمان ناهێنێ؟! ئەی ئەگەر خوا ئیزنی نەدا ئەو عەبدە چی بکات؟ ئەی ئەو عەبدە چ گوناهێکی هەیە لەوەدا کەخوا ئیزن نەدات ئیمان بهێنێت؟!!

بەڵام کە لە ئایەتەکە زۆر وردبیبتەوە وەڵامەکەی تێدایەو ئەو ئیشکالانە هەموو چارەسەر ئەکات...چۆن؟ ئایەتەکە ئەفەرموێ:"هیچ کەسێك ئیمان ناهێنێ تا خوا ئیزن نەدات، خراش ڕسوایی ئەخاتەسەر ئەوانەی کەعەقڵ ناگرن" واتای ئایەتەکە ئەوەیە: ئەو کەسەی کەبڕیاریداوە عەقڵی خۆی دابخات و بەهیچ شێوەیەك گوێ بۆ خواو دینی خواو پێغەمبەرانی خوا نەگرێت، نەك ئەوە بەڵکو ئیرادەو عەقڵی خۆی ئەخاتە کار بۆ بێدینکردن و گەندەڵکردنی خەڵك، ئەو کاتە ئیتر خوا مۆر لەدڵی ئەو جۆرە کەسانە ئەدات و دوای ئەوە ئیتر ئیزن نادات ئیمان بهێنێ و بچێتە ناو مەملەکەتی پڕ توهری ئیمانەوە، کە دیارە ئەو خەتم و مۆرە ڕسواییەکی پێوەیەو شایستەیە بەو جۆرە کەسانە، جگە لەم حاڵەتە تایبەتە ئیتر خوا ئیزنی کراوەیە بۆ ئیمان و عەبد ئەك دەرفەتێك و دەیان دەرفەتی لەبەردەستدایە بۆ ئیمانهێنان بەڵکو سەدان و هەزاران دەرفەتی لەدەستدایەو ئەگەر لە خراپەکردن و ستەمکاری و درۆکردن نەگەڕێتەوە تا ئەو سنووردی کە مۆر لە دڵی ئەدرێت پێویستە لۆمەی کەس نەکات خۆی نەبێت، چونکە دیارە خوای گەورە دەیان و سەدان جار لێبووردنی بۆ دەرئەکات لەسەر ئەو گوناهو خراپانەی ئەیانکات!خوای گەورە ئەفەرموێت:( تِلْكَ الْقُرَى نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَائِهَا وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا بِمَا كَذَّبُوا مِنْ قَبْلُ كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِ الْكَافِرِينَ (١٠١) وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِمْ مِنْ عَهْدٍ وَإِنْ وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ)یان

ئەفەرموێ:(خَتَمَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ)، یان ئەفەرموێ:( أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا)یان ئەفەرموێ:(كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ)..پێغەمبەریش(صلى الله عليه و اله وسلم)ئەفەرموێت:( يَخْرُجُ الرَّجُلُ فِي غَنَمِهِ إِلَى حَاشِيَةِ الْقَرْيَةِ فَيَشْهَدُ الصَّلَوَاتِ وَيَؤُوبُ إِلَى أَهْلِهِ،حَتَّى إِذَا أَكَلَ مَا حَوْلَهُ وَتَعَذَّرَتْ عَلَيْهِ الأَرْضُ، قَالَ:لَوِ ارْتَفَعْتُ إِلَى رَدْهَةٍ هِيَ أَعْفَا كَلا مِنْ هَذِهِ، فَيَرْتَفِعُ حَتَّى لا يَشْهَدَ مِنَ الصَّلَوَاتِ إِلا الْجُمُعَةَ، حَتَّى إِذَا أَكَلَ مَا حَوْلَهُ وَتَعَذَّرَتْ عَلَيْهِ الأَرْضُ، قَالَ: لَوِ ارْتَفَعْتُ إِلَى رَدْهَةٍ هِيَ أَعْلا كَلأً مِنْ هَذِهِ، فَيَرْتَفِعُ حَتَّى لا يَشْهَدَ جُمُعَةً، وَلا يَدْرِي مَا يَوْمُ الْجُمُعَةِ حَتَّى يُطْبَعَ عَلَى قَلْبِهِ "، المعجم الكبير للطبراني وخرجه الإمام أحمد بمعناه.." المسند " ( ٥ / ٤٣٣-٤٣٤) .ئیمامی موسلیم ئەفەرموێت:( عن ابن عمر - رضي الله عنهم - : أنهما سمعا رسولَ الله - صلى الله عليه وسلم - ، يقولُ عَلَى أعْوَادِ مِنْبَرِهِ : (( لَيَنْتَهِيَنَّ أقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الجُمُعَاتِ أوْ لَيَخْتِمَنَّ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الغَافِلِينَ )) رواه مسلم . هەروەها ئەفەرموێت:(إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا أَذْنَبَ ذَنْبًا كَانَتْ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ فِي قَلْبِهِ، فَإِنْ تَابَ وَنَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ صُقِلَ مِنْهَا قَلْبُهُ، وَإِنْ زَادَ زَادَتْ حَتَّى يُغْلَقَ بِهَا قَلْبُهُ فذلك الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي كِتَابِهِ:(كَلا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ)!..لە فەرموودەیەکی تریشدا روونتر ئەفەرموێ:(تُعْرَضُ الفِتَنُ عَلَى القُلُوبِ كَالْحَصِيرِ ، عُوداً عُوداً ، فَأيُّ قَلْبٍ أُشْرِبَهَا ، نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ ، وَأيُّ قَلْبٍ أنْكَرَهَا ، نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ بَيْضَاءُ ، حَتَّى تَصِيرَ عَلَى قَلْبَيْنِ ، عَلَى أبْيَضَ مِثْلِ الصَّفَا ، فَلاَ تَضُرُّهُ فِتْنَةٌ مَا دَامَتِ السَّماوَاتُ وَالأرْضُ ، وَالآخَرُ أسْوَدُ مُرْبَادّاً ، كَالْكُوزِ مُجَخِّياً ، لاَ يَعْرِفُ مَعْرُوفاً ، وَلاَ يُنْكِرُ مُنْكَراً ، إلاَّ مَا أُشْرِبَ مِنْ هَوَاهُ )). المفهم لما أشكل من تلخيص كتاب مسلم، أبو العبَّاس القرطبيُّ، موقع شبكة مشكاة الإسلامية ، لە حەدیسی قودسیشدا خوای گەورە ئەفەرموێت: "عبدي أطعتنا فقربناك وعصيتنا فأمهلناك ولوعدت الينا بعد ذلك قبلناك، أني والأنس والجن في نبأ عظيم، أخلق ويعبد غيري، وارزق ويشكر سواي، خير الي العباد نازل وشرهم الي صاعد، أتحبب اليهم بنعمتي وأنا الغني عنهم ويتبغضون الى بالمعاصي وهم أفقر شيء الي، من بعد منهم ناديته من بعيد ومن قرب منهم ناجيته من قريب، أهل ذكري أهل عيبادتي، أهل شكري أهل زيادتي أهل طاعتي أهل محبتي، أهل معصيتي لا اقنطهم من رحمتي، أن تابوا الي فأنا أحبهم أحب التوابين وأحب المتطهرين، وان لم يتوبوا فأنا طبيبهم ابتليهم بالمصائب، لأطهرهم من الذنوب والمعايب، الحسنة عندي بعشر امثالها او ازيد والسيئة عندي بمثلها او اعفو، وانا أرحم بعبادي من الام بولدها" إبن تيميه لە (منهاج السنة): (٥/ ٢١٠) بەشێك لە ئەم (أثر)ە باسەکات.

واتە: ئەی عەبدەکەم! تا گوێڕایەڵیت ئەکردین لە خۆمانمان نزیك ئەکردیتەوە، کە دەستیشت دایە گوناهکردن مۆڵەتمان پێ دای و لێت گەڕاین، ئەگەر دوای ئەو گوناهانەش بگەڕێیتەوە بۆ لامان هەر قەبووڵت ئەکەین، من و مرۆڤ و پەری لەناو دەنگوباسێکی گەورەداین، من ئەیانخولقێنم کەچی ئەوان عەبدایەتی جگە لە من ئەکەن، من رزقیان ئەدەم کەچی ئەوان سوپاسی جگە لە من ئەکەن! خێروبێرم بۆ عەبدەکانم دێتەخوارەوە کەچی ئەوان شەڕو خراپەیان بۆمن دێتە سەرەوە، خۆمیان لا خۆشەویست ئەکەم بەو هەمووە رۆزیەی پێیان ئەدەم ـ کە من هیچ پێویستیشم بەوان نییە ـ کەچی ئەوان من عاجز ئەکەن لە خۆیان بەو هەمووە گوناهەی ئەیکەن ـ لە کاتێکدا ئەوان پێویستی زۆریان بە من هەیە، هەرکەسێکیان دووربکەوێتەوە لەدوورەوە بانگی لێئەکەم، هەرکامیشیان نزیکبکەوێتەوە لە نزیکەوە موناجاتی ئەکەم، ئەوانەی سەرقاڵی یادکردنی منن شایەنی ئەوەن لە مەجلیسی

• عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ، يَنْفَعُ الدَّوَاءُ مِنَ الْقَدَرِ؟ قَالَ:الدَّوَاءُ مِنَ الْقَدَرِ، وَقَدْ يَنْفَعُ بِإِذْنِ اللَّهِ.[1]

د- خوای گەورە رایگەیاندووە كەخەڵكی ئازادن -و بەڕاستیشیێتی- لە هەڵبژاردنی دین و بێدینی و گۆڕان و مانەوە لەناو ستەم و تاریكیدا:

﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ..

---

منداڵن، ئەوانەی سوپاسی من دەكەن شایەنی ئەوەن زیاتر بڕژم بەسەریاندا ئەوانەی عیبادەتی من ئەكەن شایەنی ئەوەن خۆشەویستی من بن، ئەوانەی بێگوێی من دەكەن بێهیوایان ناكەم لە ڕەحمەتو سۆزی خۆم، ئەگەر (لە كۆتاییدا) گەڕانەوە ئەوە خۆشم ئەوێن، كەسی تۆبەكارو پاكم خۆش ئەوێت، ئەگەر تۆبەش نەكەن ئەوە من ئەبم بە دكتۆریان، توشی لێقەومانو موسیبەتیان ئەكەم تا پاك ئەبنەوە لە شوورەیی‌و گوناهەكانیان،چاكە لای من دەتەوەندەی خۆی پاداشتی هەیە یان زیاتریشیان ئەدەمێ، خراپەش لای من هەر یەك پاداشتی هەی یان لێشیان ئەبوورم، (بەدڵنیاییەوە) من بەرانبەر عەبدەكانم بە میهرو بەرەحمترم لە دایكێك بەرانبەر بە منداڵەكەی"!!.

لەم ئایەت و حەدیسانەوە دەرئەكەوێت كە خوا دەرفەتی زۆر بە عەبد ئەدات بۆ ئیمانهێنان، بەلام ئەو هەموو ئەو دەرفەتانە لەدەست خۆی دەرئەكات و ئەگاتە ئەوەی كە گاڵتەی بێت بە ئیمان وخواو دین، بۆیە پاش ئەو هەمووە دەرفەتە كە ئەیدا بەعەبدو ئەو عەقڵی ناداتێ خواش مۆر لەدڵی ئەدات و ئیتر لێی یاساغ ئەبێت بچێتە مەملەكەتی ئیمان كە ئەو خۆی گاڵتەی پێی دێت، بۆ باس ئەشێت كە خوای گەورە وشەی:"ران"و"طبع"و"اقفال"و "ختم"ی بەكارهێناوە لەم بابەتەدا، زانایان ئەڵێن:" الرين أيسر من الطبع، والطبع أيسر من الإقفال والإقفال أشدها"، قازی"عەیاز"یش بۆ مانای ئەو وشانە ئەفەرموێ: "اختلف المتكلمون في هذا اختلافاً كثيراً، فقيل هو إعدام اللطف وأسباب الخير، وقيل هو خلق الكفر في صدورهم وهو قول أكثر متكلمي أهل السنة، وقال غيرهم: هو الشهادة عليهم، وقيل هو علامة جعلها اللّه تعالى في قلوبهم لتعرف بها الملائكة من تمدح ومن تذم" بڕوانە: دليل الفالحين شرح رياض الصالحين(٤٧٣/٦). منیش ڕای بۆ ئەچم كە دڵ وەك چۆن بە گوێگرتن و گوێڕایەڵی بۆ خواو پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه و اله وسلم) پلەپلە ڕوناكئەبێتەوەو ئارام ئەگرێت و لە ئەخۆشی ڕزگاری ئەبێت، بەهەمان شێوە بە گوناهكردن و درۆو ستەم و بێوەعدی ئەخۆش ئەكەوێت و پلەپلە تاریك ئەبێت و ئامادەیی تێدا ئامێنێ بۆ وەرگرتنی دین و لەرزۆك ئەبێت و تا ئەگاتە ئەوەی خەتم و مۆرئەكرێت و پاشان قوفڵی لێئەدرێت، ئەمانە قۆناغ بە قۆناغ ڕووئەدەن و عەبد ئەتوانێ تا كۆتا هەنگاو بە تۆبەو پەشیمانبوونەوەو كاری باشە دڵی چارەسەر بكات، پێش ئەوەی بگاتە ئەوەی كە خوا ئیزنی لێبگرێتەوە كە ئیتر ڕەنجەڕۆو ڕەنجەساری دونیاو ئاخیرەت ببێت"پەنا بەخوا".

[1] معجم الطبراني رقم الحديث: ١٢٦١٣.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾..

دووهەم: تیشکردنو (كسب)واجبی عەبدەو وازهێنان لەكار بەبیانووی (قەدەر چی نووسی تێپەڕی تازە) درۆکردنە بەدەم خوای پەروەردگارەوە.

خوای گەورە ئەفەرموێ:

- (فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر)، بەدڵنیاییەوە خوای گەورە راستگۆشە لەم قسەیەدا.
- (و ان الله لهادي الذين امنوا الى صراط مستقيم) بە دڵنیاییەوە خوای گەورە راستگۆشە لەم قسەیەدا.
- (فلما زاغوا ازاغ الله قلوبهم) بە دڵنیاییەوە خوای گەورە راستگۆشە لەم قسەیەدا.
- (ان الله لا يهدي من هو مسرف كذاب) بە دڵنیاییەوە خوای گەورە راستگۆشە لەم قسەیەدا.
- ئەبوزەڕی غیفاری ئەفەرموێ: خرج رسول الله صلى الله عليه وسلم على أصحابه وهم يتذاكرون شيئا من القدر، فخرج مغضبا كأنما فقئ في وجهه حب الرمان فقال: «أبهذا آمرتم ؟ أوما نهيتم عن هذا ؟ إنما هلكت الأمم قبلكم في هذا، إذا ذكر القدر فأمسكوا، وإذا ذكر أصحابي فأمسكوا، وإذا ذكرت النجوم فأمسكوا »[1] پێغەمبەر(صلى الله عليەو الە وسلم) چووەناو صەحابەکانی و ئەوانیش باسی قەدەریان ئەکرد، بەتووڕەییەکەوە هاتە دەرەوە وەك ئەوە وابوو دەنکی هەنارت بە روویدا تەقاندبێت، و فەرمووی: ئەوە ئێوە بەو شێوەیە

[1] الإبانة الكبرى لابن بطة، ابن بطة العكبري، http://www.alsunnah.com

فەرمانتان پێکراوە؟ ئەی ئەوە رێگریتان لەوە لێنەکراوە؟ دڵنیابن میللەتە پێشووەکانی تێوە لەسەر ئەو شتانە لەناوبران، ئەگەر باسی قەدەر هاتە پێشەوە دەستبگرنەوە، ئەگەر باسی هاوەڵانی من هاتە پێشەوە دەستبگرنەوە، ئەگەر باسی فاڵ و ئەستێرە هاتەپێشەوە دەستبگرنەوە[1].

- ئیمامی ئەبوبەکر ئەفەرموێت: (اقول برأي فأن كان خطئا فمني ومن شيطاني وان كان صوابا فمن الله)، من بیروڕای خۆم دەرئەبڕم، جا ئەگەر هەڵەبوو ئەوە لەنەفس و شەیتانی خۆمەوەیە، ئەگەر راست و دروستیش بوو ئەوە لەخوای پەروەردگارەوەیە.

- ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێبێت)پرسیاری لە کابرایەك کرد بۆچی دزیت کردووە؟ وتی: قەدەری خوا وابوو قوربان! عومەر فەرمانی کرد دەستی ببڕن و چەند (جلد)ێکیشی لێبدەن. وتیان(جلد) بۆ، قوربان؟ فەرمووی: دەستبڕینەکەی لەبەر دزییەکەی، (جلد)ەکەش لەبەر ئەوەی درۆ بەدەم خواوە ئەکات..(وەك تەعزیرو تەمێکردن).

- پیاوێکی بەتەمەن لە ئیمامی عەلی پرسی پاش ئەوەی لە شەڕی (صفين) گەڕانەوەو لەکوفەدا دانیشتبوون: ئەرێ ئیمام!باسی ئەم رۆیشتن و شەڕکردنەمان لەگەڵ خەڵکی شامدا بۆ ناکەیت، ئایا ئەوەی ڕوویدا بەقەزاو قەدەری خوا بوو؟ عەلیش فەرمووی:بەڵێ پیاوی بەتەمەن!هەنگاوێکتان نەناوەو نەچوونەتە ناو شیوو دۆڵێك بە قەدەرو قەزای خوا نەبووبێت، کابرای ریش سپی پێیووت: دەی خوا رەحم بکات و ئەم هەموو ماندووبوونەمان بۆ حسێب بکات، کابرا بە هەڵە لە ئیمامی

---

[1] مەبەستی پێغەمبەر(صلى الله عليه و اله وسلم)ئەوە نیە کە هەر قسەی تێدا نەکرێت، بەڵکو -خوا زاناترە- مەبەستی ئەوەیە کە شەڕە بەڵگەی تێدا نەکرێت و بە بێ بەڵگەی روون و ئاشکرا قسەی تێدا نەکرێت.

عەلی تێگەیشت و وایزانی پێشەوا عەلی بڕوای بە(جەبرییەت)هەیە، بۆیە پێشەوا (عەلی) بۆی ڕۆشنکردەوەو فەرمووی:مە یا شیخ! واللە لقد عظم اللە لکم الاجر في مسیرکم وانتم سائرون، وفي مقامکم وانتم مقیمون، وفي منصرفکم وانتم متصرفون ولم تکونوا في شئ من حالاتکم مکرهین، ولا إلیه مضطرین... راوەستە پیاوی بەتەمەن! سوێند بەخوا پاداشتی گەورەی بۆ نووسیون لەم کاروان و هاتن و ڕۆیشتنەتانداو لە ناومالّ و منالّەکانیشتانداو لە چوونەوە بۆ شوێنی خۆشتان، و لەهەریەك لەم کارانەشتاندا زۆرتان لێنەکراوەو ناچارنەکراون بەو کارانە، کابرای ریش سپی پێیووت:"کیف لم نکن في شئ من حالاتنا مکرهین ولا إلیه مضطرین وکان بالقضاء والقدر مسیرنا ومنقلبنا ومنصرفنا؟"، چۆن بەزۆر نەهاتووین و ناچارنەکراوین کە هەموو ئەو ڕۆیشتن و هەڵگەڕانەوەو گەڕانەوەمان بەقەزاو قەدەر بووبێت، عەلی پێی فەرموو:"اتظن انه کان قضاء حتما وقدرا لازما، انه لو کان کذلك لبطل الثواب والعقاب والامر والنهي والزجر من اللە، وسقط معنى الوعد والوعید،ولم تکن لائمة لمذنب ولا محمدة لمحسن، ولکان المذنب اولى بالاحسان من المحسن، والمحسن أولى بالعقوبة من المذنب، تلك مقالة عبدة الاوثان وخصماء الرحمن وحزب الشیطان وقدریة هذه الامة ومجوسها. ان اللە کلف تخییرا، ونهى تحذیرا، واعطى على القلیل کثیرا ولم یعص مغلوبا، ولم یطع مکرها ولم یملك مفوضا، ولم یخلق السموات وما بینهما باطلا، ولم یبعث النبیین مبشرین ومنذرین عبثا، "ذلك ظن الذین کفروا فویل للذین کفروا من النار"[1]. باشە واگومان ئەبەی کە ئەو شتانە بڕیارێکی حەتمی و نەخشەیەکی نەگۆڕە، جا ئەگەر ئەوە وابێت کەواتە

[1] بڕوانە کتێبی"دراسات في الحدیث والمحدثین" http://www.yasoob.com،هەروەها سەیری ( أنوار البروق في أنواء الفروق (مع الهوامش)، أبو العباس القرافي،حقیق خلیل المنصور، دار الکتب العلمیة،١٤١٨هـ - ١٩٩٨م).

پاداشــت و ســزاو فــەرمان و ڕێگــری و گازنــدەی خــوایی هــەموو ناهەقییــە، و بەوشێوەیەش هیچ مانایەك نامێنێ بۆ بەڵێن و بۆ هەڕەشە، و جێگەی خۆی نییــە کە لۆمەی کەسی تاوانبار بکەیت و سوپاسی کەسی چاکەکار بکــەیت، ئــەو کــات بەدڵنیاییەوە کابرای گوناهبار شایستــەتر بــوو بــە ئــەو سوپاســەی کــە بەرانبــەر چــاکەکارێك ئــەکرێت و چــاکەکارەکەش شایســتەترە بــەو ســزایەی کــە بەرانبــەر گوناهبارەکە ئەکرێت، دەی ئەمە قسەی بتپەرستان و دوژمنانی خــوای بەســۆزە و قسەی هەوادارانی شەیتان و قەدەرییەو ئاگرپەرستانی ناو ئەم ئومەتەیە، دڵنیــابن کە خوا ئەرکی خستوەتە سەرشانی خەڵکی بەلاَم ئــازادن لەکردنیــدا، هەڕەشەشــی کردووە بۆ ترساندن و ئاگاداری، پاداشتی زیادیشــی ئــەداتێ لەســەر ئیشــی کــەم، خوای پەروەردگار کە بێگوێی ئەکرێت لەبەر بێدەسەلاتی ئەو نییە، کە گوێڕایەڵیش ئەکرێت بەنابەدڵی و زۆر نییە، کە بووەتە خاوەنی ئاسمانەکان و زەویش لەبەر ئــەوە نییە کە لەکەسی تردوە پێیــدرابێت، پــەروەردگار ئــەم ئاسمــان و زەمینــەو ئــەوەی لەنێوانیاندایە بە ناهەق و لەخۆڕا دروست نــەکردووە،و ئــەو پێغەمبەرانەشــی کــە ناردوونی بۆ ئەوەی خەڵکی ئاگادار بکەنەوەو مــژدەیان پێبــدەن هــەروا بــۆ گاڵتــە نەناردوون، ئەوە گومانی ئەو کەسانەیە کە کافرن، دەی ئاگرو لەناوچــوون بــۆ ئــەو کەسانەی کە کافر ئەبن.

- قازی عەبدولجەببار لە ئیمامی عومەرەوە ئەگێڕێتەوە لەکتێبی "طبقـات المعتزلـة"دا ئەڵێ: لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ئەگێڕنەوە کە کابرایەك لەروویدا هەستایەوەو وتــی: ئــەرێ بــاوکی عەبــدوڕەحمان! هەنــدێ کــەس هەیــە لای ئێمــە زینائەکەن و دزینەکەن و مەی ئەخۆنەوەو خــەڵکی بەناهــەق ئــەکوژن و ئەشــڵێن: ئەمە لە عیلمی خوادا هەبووە کە ئێمــە وابکــەین بۆیــە نــاکرێ وانەکــەین!! ئــیبن

عومەریش تووڕەبوو وتی: بێعەیبی بۆ خوای گەورە، راستە لە عیلمی خوادا هەبووە کە ئەوان وا ئەکەن بەلاّم خۆ ئەو عیلمە ناچاری نەکردوون کە ئەو کارانە بکەن، باوکم عومەری کوڕی خەتتاب بۆی گێڕامەوە کە گوێی لە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)بووە فەرموویەتی:"مثل علم الله فيكم كمثل السماء التي أظلتكم، والأرض التي أقلتكم، فكما لا تستطيعون الخروج من السماء والأرض فكذلك لا تستطيعون الخروج من علم الله تعالى، وكما لا تحملكم السماء والأرض على الذنوب فكذلك لا يحملكم علم الله تعالى عليها"[١]. نموونەی زانستی-واتەسیستەمەکانی خوا کە لەڕووی زانستی خواوە دانراون بۆ ژیان-وەك ئەم ئاسمانە وایە کە سەری لێگرتوون و وەك ئەم زەمینە وایە کە ژێری لێگرتوون، وەك چۆن ناتوانن لە سنووری ئاسمانەکان و زەمین بچنە دەرەوە هەرواش ناتوانن لە سنوورەکانی زانستی خوا بچنە دەرەوە، بەهەمان شێوە وەك چۆن ئاسمانەکان و زەمین ناچارتان ناکەن گوناهێکی دیاریکراو بکەن، بەهەمان شێوە زانستی خواش ناچارتان ناکات گوناهێکی دیاریکراو بکەن.

- لەجابیری کوڕی عەبدوڵاوە ریوایەتکراوە کەپێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) فەرموویەتی :(يكون في آخر الزمان قوم يعملون بالمعاصي ثم يقولون: الله قدرها علينا، الراد عليهم يومئذ كالشاهر سيفه في سبيل الله)، لەئاخری زەماندا کۆمەڵێك پەیدائەبن سەرئەکەنە گوناه وپاشان ئەڵێن:خوا لەسەری نووسیوین، ئەو رۆژە هەرکەس وەڵامیان بداتەوە وەك ئەوە وایە کە شمشێری لەپێناوی خوادا هەڵکێشابێت.

---

[١] فرق وطبقات المعتزلة/ ص ٢٤.هەروەها" مفاتيح الغيب"الرازي،موقع شبكة مشكاة الإسلامية /http://www.almeshkat.net

- ریوایەتیشكراوە كە كابرایەك هاتە لای حەسەنی بەصری و ووتی:ئەی ئەبوسەعید!من ژنەكەمم سێ تەلاقەداوە، چاكتەكرێتەوە؟ ئەویش فەرمووی: مالوێران دەی چی ناچاری ئەمەی كردی؟ وتی: قەزاو قەدەر! شێخ حەسەنیش پێیوت:تۆ درۆ بەدەمی پەروەردگارەوە ئەكەی بۆیە ژنەكەت لێ حەرامبووە!
- هەر لە حەسەنی بەصرییەوە ریوایەتكراوە كە دای بەلای فوزەیلی كوڕی بورجا كرابوو بە دارا! ئەویش پێیوت: چی ناچاری ئەم دزیكردنەی كردی؟ وتی: قەزاو قەدەری خوا! وتی: درۆت فەرموو سپڵەی ناكەس بەچە! قابیلە خوا دزیشت پێبكات و دەستیشت ببڕێ؟!
- لە ئیبن سیرینیشەوە ئەگێڕنەوە كە لەكابرایەك ئەپرسێت فلانەكەس چۆنە؟ ئەویش ئەڵێ: بەو شێوەیە كەخوا ئەیەوێت؟ ئیبن سیرینیش وتی: مەڵێ بەو شێوەیە كەخوا ئەیەوێت، بەڵكو بڵێ: بەو شێوەیە كە خوا ئەیزانێت، چونكە ئەگەر بەو شێوەیە بێت كەخوا ئەیەوێت ئەوە پیاوێكی زۆر صالح و باش ئەبێت.
- ئیمامی نەوەوی(رحمه الله) ئەفەرموێت: لە كتێبی "سنن أبي داود"دا لە عەوفی كوڕی مالیكەوە رەزای خوای لێبێت ریوایەتكردووە كە پێغەمبەر(صلی الله علیەو الەوسلم) شەرعی دوو كەسی ئەكرد"كابرای كە شەرعەكەی كراو دۆڕاندنی، پشتی هەڵكردو وتی:"حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ"، پێغەمبەریش(صلی الله علیەو الە وسلم) فەرمووی:" إنَّ اللَّهَ تَعالى يَلُومُ على العَجْزِ، وَلَكِنْ عَلَيْكَ بالكَيْسِ فإذَا غَلَبَكَ أمْرٌ فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ و نِعْمَ الوَكِيلُ"[1] خوا لۆمەی كەسی دەسەوسان ئەكات،

[1] نەوەوی لەكتێبی"الاذكار"دا ئەفەرموێ:حافیز ئیبن حەجەر ئەفەرموێ: هذا حديث حسن أخرجه أبو داود والنسائي، وفي سنده سيف، منیش ئەڵێم (قسەكە هی نەوەوییە): الكَيْس بفتح الكاف وإسكان الياء، چەند مانایەك ئەگەیەنێت: لەوانە نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی، بەلآم مانای دروستی- والله أعلم-بریتییە لە : بەئەركی سەرشانتی بزانە نەرم و لەسەرخۆبە و ئەوەندە كار بدەرەبەر كە بتوانی ئەنجامیان بدەیت و بەردەوامیش بی لەسەری.

تۆش ئەركی سەرشانتە كە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتدا بكەیت، ئەگەر شتێكیش دەستی لێكردیتەوە (وچارت نەنەكرد) ئەوە بڵێ: خوام بەسەو هەر خواش باشترین بریكارە..

● ڕیوایەتكراوە لە عومەری كوڕی هەیسەمەوە[١] كە وتوویەتی: جارێكیان لە كەشتیەكدا سواربووم كابرایەكی ئاگرپەرست و كابرایەكی قەدەریمان لەگەڵدا بوو، كابرای قەدەری بەكابرای ئاگرپەرستی ووت: بۆچی موسڵمان نابی؟ ئەویش وتی: ئاخر خوا نایەوێت! كابرای قەدەری ووتی: درۆنەكەی خوا نەیەوێت بەڵام شەیتان نایەوێت و نایەڵێت! كابرای ئاگرپەرست وتی: كەواتە شەیتان نەیەوێت و خوا نایەوێت كەچی ویستەكەی شەیتان هاتووەتە دی نەك ئەوەی خوا! بەڕاستی شەیتان كائینێكی بەهێزە! لە ڕیوایەتێكی تردا ئەڵێ: كابرای ئاگرپەرست وتی: دەی من لەگەڵ بەهێزەكەیاندا ئەبم![٢].

● پیاوێكی لادێیی ژیر هاتە لای عەمری كوڕی عوبەید كە پیاوێكی زاهیدو خواناسی سەیربوو، كابرای لادێیی -كە خەڵكی بەصرە بوو- هوشترێكی لێون بووبوو، هەر نەیئەدۆزییەوەو سەرگەردان لادێكانی بۆ ئەگەڕا، پێیانوت: بڕۆ بۆ لای ئەو پیاوە خواناسە صاڵحە با دوعات بۆ بكات و هوشترەكەت بدۆزیتەوە، ئەویش چوو بۆ لای عەمری كوڕی عوبەیدو شكاتی حاڵی خۆیی لاكرد و وتی:

---

١ ناوی عەمری كوڕی هەیسەمی كوڕی قەتنی زوبەیدییە، حەدیسی لەئەبوحەنیفەو مالیكەوە گێڕاوەتەوەو ئەحمەدو یەحیای كوڕی مەعینیش حەدیسیان لەئەمەوە گێڕاوەتەوە، ئەبوداودیش ئەڵێ: جێگەی متمانەیە، بڕوانە:"العسقلاني، تهذيب التهذيب،١٤ج، دار الفكر-بيروت،١٤٠٤هـ -١٩٨٤م،(ج١٠/ص٣٨١) رقم ٧٧٣. هەردوو ترێژەری كتێبی" العقيدة الطحاوية"ئەڵێن:"هو ثقة مات على رأس المائتين (التركي، الأرناؤوط، شرح العقيدة الطحاوية: ٣٢٣/١).

٢ كتاب الشريعة، الاجري، ص:٢٤٤.

بەڵکو دوعایەکم بۆ بکەی خوا هوشترەکەم پێبداتەوە، عەمریش –کە بڕوای وابوو خوا هەقی بەسەر مرۆڤەوە نیەو نەبێ خۆی بەرپرسیارێتی خۆی و کارەکانی هەڵبگرێت و بڕوای بەقەدەرو قەزا نەبوو- دەستی بەرزکردەوەو بۆ ئاسمان و ووتی:" اللهم إنك لم ترد أن تسرق ناقة هذا الأعرابي، اللهم فارددها عليه"! کابرای ژیری لادێنشین تێگەیشت لە بیروبۆچوونی عەمرو تووڕەبوو لێی و وتی:" لا حاجة لي في دعائك!! ما دام أنه أراد أن لا تسرق فسرقت، فأخشى أن يريد أن ترجع فلا ترجع"!!.[١]، پێویستم بەدوعای تۆ نیە! مادامێك ئەو نەیویستووە بدزرێت و کەچی هەر دزرا، ئەترسم بیەوێت بیدۆزمەوەو کەچی هەر نەیدۆزمەوە!

- زانایان ئەڵێن: هەندێ لەزانایانی ئەهلی سووننەت لەگەڵ یەکێك لە سەرانی موعتەزیلەدا بووەتە موناقەشەو مشتومڕیان، کابرای موعتەزیلی وتوویەتی: "سبحان من تنزه عن الفحشاء" کابرای سوونیش ووتوویەتی:"سبحان من لا يقع في ملكه الا مايشاء"، کابرای موعتەزیلی وتویەتی:"أيشاء ربنا أن يعصي" ، کابرای سوونی وتویەتی:" أفيعصى ربنا قهرا"؟ ، کابرای موعتەزیلی وتویەتی:" أرأيت أن منعني الهدى وقضى علي بالردى أحسن الي أو أساء؟"، کابرای سوننی وتوویەتی:" ان كان منعك ما هو لك فقد أساء، وان كان منعك ما هو له فإنه يختص برحمته من يشاء"، کابرای موعتەزیلی ماتبووەو قسەی پێنەماوە![٢]

سێیەم: قەزاو قەدەریش وەك ئیبن تەیمیيە ئەفەرموێت: دوو پلەیە:

پلەی یەکەم(قەدەر) دووشتە:

---

[١] شرح العقيدة الطحاوية ،سفر الحوالي.

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(١) بڕوات وا بێت هەرچی عەبد بیکات خوا بە عیلمی ئەزەلی خۆی ئەیزانێت.خوای گەورە ئەفەرموێ: ( وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي السَّمَاءِ وَلا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِيْنٍ ) ﴿یونس: ٦١﴾، هەروەها ئەفەرموێ:( وَخَلَقَ كُلَّ شَيءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً ) ﴿الفرقان: ٢﴾، هەروەها ئەفەرموێ:( وَكَانَ أَمْرُ اللهِ قَدَرَاً مَقْدُوراً ) ﴿الأحزاب: ٣٨﴾.هەروەها ئەفەرموێ:(اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا).

(٢) هەموو ئەو شتانەشی لە (لەوحولمەحفوز)دا تۆمار کردووە.[1]

- ( ألم تعلم أن الله يعلم ما في السماء والأرض إن ذلك في كتاب إن ذلك على الله يسير )
- ( ما أصاب من مصيبة في الأرض ولا في أنفسكم إلا في كتاب من قبل أن نبرأها إن ذلك على الله يسير ).

---

[1] بۆ زیاتر نزیککردنەوەی ئەم چەمکە لە زیهن — لەم نمونانە بڕوانە- :خوای گەورە هاتنی پێغەمبەری ئیسلامی لە تەوراتدا نووسیوەو سیفەت و کارو چالاکیەکانیشی باسکردووەو پاش چەند هەزار ساڵ دوای ئەوە پێغەمبەری ئیسلام دێتە بوون و ئەو سیفەت و کارو چالاکیانە ئەنجام ئەدات، یان قورئان ئەو هەمووە هەواڵە بۆ داهاتوو باس ئەکات وەك" چارەنووسی بەنی ئیسرائیل، سەرکەوتنی رۆم، شکستخواردنی جەمعی قورەیش، ...هتد"،خوای گەورە ئەفەرموێ:(وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا (٤) فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ أُولَاهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَنَا أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا خِلَالَ الدِّيَارِ وَكَانَ وَعْدًا مَفْعُولًا)، یان ئەفەرموێ: (الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٥٧) ، هەروەها ئەفەرموێ:( الم (١) غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ (٤) بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ (٥) ، هەروەها ئەفەرموێ: (أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُنْتَصِرٌ (٤٤) سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ)..

- ئیبن تەیمیە ئەفەرموێ: (وهذا التقدير - التابع لعلمه سبحانه - يكون في مواضع جملة وتفصيلا فقد كتب في اللوح المحفوظ ما شاء).

پلەی دووهەم(قەزا) کە ئەویش دوو شتە:

(١)بڕوات وابێت خوای گەورە هەرچی ویست ئەیکات و هەرچیشی نەویست نایکات.

(٢) فەرمانیشی بە عەبد کردووە کە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوابن، (رێگری)شی لێکردون گوناه بکەن، خوای گەورەش خوناس و چاکەکارو پیاوی دادپەروەری خۆش ئەوێت، هەر کەس لە ئیمانداران کە کاری چاکە دەکات خوا لێی رازییەو، کافرو بێ دینیشی خۆش ناوێت وڕازی نییە لێیان، عادز ئەبێت لەوانەی کە خەڵکی فێری گوناه و بێدینی ئەکەن، بە کوفر ڕازی نییەو خراپەکاریی پێخۆش نییە.

(ئیبن تەیمیە) ڕۆشنتر ئەفەرموێت: (والعباد فاعلون حقيقة والله خالق افعالهم والعبد هو المؤمن والكافرو البرو الفاجر و المصلي والصائم، وللعباد قدرة على أعمالهم و لهم ارادة والله خالقهم وخالق قدرتهم، وهذه الدرجة من القدر يكذب بها عامة القدرية الذين سماهم النبي مجوس هذه الأمة و يغلو فيها قوم من أهل الأثبات حتى سلبوا العبد واختياره ويخرجون عن افعال الله حكمها و مصالحها)[١] .

بەڵام لەڕاستیدا ئەبێ و پێویستە بۆ نەهێشتنی تەناقوز لەو قسانەی ئیبن تەیمیەو زانایانی تریشدا یەك پلەی تر زیاد بکرێت بۆ ئەو چوار پلەیەو ببنە پێنج پلە، کە شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە ئەفەرموێ:(هەموو ئەو شتانەشی لە

---

[١] مجموع الفتاوى/ج٣/ ص١٥١.

(لەوحولمەحفوز)دا تۆمارکردووە.) ئەبێ ئەم پلەیەش بخەینەسەری ئەویش ئەوەیە: کە خوا ئیزنی داوە هەر عەبدێك ئیرادەی بخاتەکارو رەنج بدات و وەسیلەی دروست بگرێتەبەر بۆ گۆڕینی ئەو قەدەرانە کەلەو کتێبەدا نووسراون ئەوە بێگومان ئەگەری سڕینەوەیان هەیە-دیارە ئەگەر خوا ئیزن بدات- خوای گەورە کە ئەفەرموێ:( وما يعمر من معمر ولا ينقص من عمره إلا في كتاب} ئەشفەرموێت: ( يمحو الله ما يشاء ويثبت وعنده أم الكتاب)..

کەواتە: دوعاکردن بۆ گۆڕینی ئەو قەدەرانە وەسیلەی دروستەو ئەو قەدەرانە ئەگۆڕێت، جیهاد بۆ گۆڕینی قەدەرەکان وەسیلەیەکی دروستەو قەدەرەکان ئەگۆڕێت، خوێندن و خوێندنەوەو توێژینەوە وەسیلەی دروستن بۆ گۆڕینی قەدەرەکان و ئەیانگۆڕن، کاسبیکردن و نەخشەی زانستی و مەنتیقی وەسیلەی دروستن بۆ گۆڕینی قەدەرەکان و ئەیانگۆڕن.. بەلاَم نەزان هیچ هەولێك نەدات و نەزانینەکەی بخاتەسەر شەرع، یان هەژار هەولنەدات و هەژاریەکەی بخاتە سەر شەرع، کەسی بێدەسەلاَت و دواکەوتوو لەخەلکی هەولنەدات و بەجێمان و بێدەسەلاَتیەکەی بخاتە سەر شەرع و کەسی بێدین و ستەمکار هەولنەدات بۆ رزگار بوون لەو بێدینی و ستەمکاریەو بێدینی و ستەمەکانی بخاتە سەر شەرع... ئەمانە قەدەرەکانیان وەك خۆیان ئەمێننەوەو ئەبێ هەر لۆمەی خۆشیان بکەن لەڕاستیداو ناڕەوایە نەزانین یان بێدینی یان ستەمکاری یان هەژاری خۆیان بکەن بەخەتای شەرع و بیخەنە سەر خوا.

خوای گەورە ئەفەرموێ:( يَسْأَلُهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ (٢٩) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ(٣٠)، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمیندا هەیە هەموویان پێویستیەکانی خۆیان لەخوای پەروەردگار داوانەکەن بۆ دونیاو بۆ

ئاخیرەتیان، ئەویش هەموو رۆژێك لە کۆڕانی شتەکاندایەو ئەم بەرزنەکاتەوەو ئەو ئەخاتە ژێرەوە، ئێوە کام لە نیعمەتەکانی خوا بەدرۆ ئەزانن.

"دووربێت لە خواچوواندن بە خەڵك" ئەمە وەك ئەو کۆمەڵە مامۆستایە وایە کە ئەخشەی رۆژانە دائەنێت بۆ قوتابییەکانی و لەپاڵ هەریەکەشیاندا هەڵسەنگاندنی خۆی و پێشبینی بۆ سەری ساڵی ئەو قوتابییە نووسیوە، جا هەرکە ئەو قوتابییە هەوڵئەدات و ئەو نمرانە ئەگۆڕێت مامۆستاکەش بەو پێیە ئەنجامەکان ئەگۆڕێت و ئەمەیان کە مامۆستاکە بەتەمای یەکەمی بوو بۆی، بە کەمتەرخەمی و هەوڵنەدان نمرەکانی خۆی هێناوەتە خوارەوەو ئەوی تریان کە ئەم بەتەمای کەوتنی بوو، بە کۆشش و هەوڵدان نمرەکانی خۆی بردووەتە سەرەوەو سەرکەوتنی بەدەست هێناوەو ئەوانەش کە هەر لەسەر رێچی خۆیان ماونەتەوە چارەنووسیان بەو شێوەیە ئەبێت کە مامۆستاکە پێشبینی بۆ کردوون..

هەرچەندە زانست و پێشبینی خوا وەك هی خەڵکی نییە، خەڵك ئەگونجێت نەیزانێت و وادەرنەچێت بەڵام ئەو ئەگەرە سەبارەت بەخوا وا نییە، خەڵك ئەگونجێ ئەوە گران بێت بۆی کە ئەو هەمووە پێشبینییە بکات کە داهاتووی لێ نادیارەو ئاگایەکی لێی نییە، بەڵام خوا وانییەو ئەوە ئاسانە بۆی وەك ئەفەرموێ: (وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجًا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنْثَى وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ وَمَا يُعَمَّرُ مِنْ مُعَمَّرٍ وَلَا يُنْقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (١١)، هەروەها ئەفەرموێ:(مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٢٢) لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (٢٣)، چەند فەرموودەیەکیش هەن ئەم مانایە روون و بەرجەستە ئەکەن.

ئــەبوهورەیرە ئەفــەرموێ پێغەمبــەر(صــلی الله علیەوالــە وسلم)ئەفەرموێ:"ما مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إلا وَلَهُ مَنزلانِ: مَنزل فِي الجَنَّةِ، ومَنـزلٌ فِي النَّارِ، وَإِنْ ماتَ وَدَخَلَ النَّارَ وَرِثَ أَهْلُ الجَنَّةِ مَنزِلَهُ" فذلك قوله:( أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ )[1].كـەس نییـە لـە ئێـوە دوو خـانووی بـۆ دانـەنرابێت، یـەکێکیان لەبەهەشتدایەو ئەویان لە ئاگردایەو ئەگەر مردو چوویە ئاگر ئەوە خانووەکەی ئەو ئەدررێت بەخەلکی بەهەشت، ئەمە مانای ئەو ئایەتەیە کەخوا ئەفەرموێ:( أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ )، ئائەوانەن کە میراتی بەهەشت ئەبەن بۆ خۆیان..

ئیبن عەبباسیش ئەفەرموێ: (أول ما خلق الله القلم خلقه من هجا قبل الألف و اللام فتصور قلما من نور، فقيل له: إجر في اللوح المحفوظ! قال: يا رب بماذا؟ قال: بما يكون إلى يوم القيامة، فلما خلق الله الخلق وكل بالخلق حفظة يحفظون عليهم أعمالهم، فلما قامت القيامة عرضت عليهم أعمالهم و قيل: {هذا كتابنا ينطق عليكم بالحق إنا كنا نستنسخ ما كنتم تعملون} عرض بالكتابين فكانا سواء.. )[2]. یانی یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کرد بریتی بوو لە قەڵەم لـە پیتەکانی هیجا دروستیکرد، پێش ئەلیف و لام، وێنەی قەڵەمێکی دروستکرد لـە رووناکی و پێیوترا: لەسەر لەوحولمەحفوز بنووسە! وتی: پەروەردگار چـی بنووسـم؟ فەرمووی: ئەوەی ئـەبێ ببێـت تـا ئەگاتـە رۆژی قیامـەت! کـە خـوای گـەورەش خولقاوەکانی خولقاند بۆ هەموو خولقاوێك چەند پاسەوانی دانـا تـا کردەوەکانیـان تۆمار بکەن و بیانپارێزن، کە قیامەتیش دێت ئـەو کردەوانـەیان پیشـانئەدرێت و پێیان ئەوترێت: ئەمە نامەی ئێمەیە بەدروستی و راستی قسەتان لەگـەڵ ئـەکات،

---

[1] فتح الباري، ابن حجر العسقلاني(٣٨٦/٦)، ورواه احمد وابن ماجة.

[2] هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه، تعليق الذهبي في التلخيص: صحيح، المستدرك ( جزء ٢ - صفحة ٤٩٢ )

ئێمە روونووس لە هەموو کارێکی ئێوە ئەگرین،کە ئەو دوو نامەیە بەراووردئەکرێن بەیەکتری هەردووکیان وەك یەکن![1]

چـوارەم: ئـەهلی سـوننەت حاڵـەتێکی مامناوەنـدن لـەنێوان جەبریـەکان و قەدەرییەکاندا، جەبریەکان کە نکوڵی لە ویست و ئیرادەو کـاری عەبـد ئەکـەن و واگومان ئەبەن ئەگەر ئیرادەو کار بۆ عەبد بسەلمێنن ئەوە وەك ئەوە وایە بیسەلمێنن دوو خولقێنەر هەیە-عەبد و خـوا-![2] و قەدەرییـەکانیش نکـوڵی لـە دەخاڵـەت و

---

[1] مەولەوی زانا دەربارەی ئەم سڕینەوەی قەدەرانە لە عەقیدە مەرضییەکەیدا لە(ل٧٧٦)دا ئەفەرموێ:

(لکن في لوح المحو والاثبـــــــــات)

بۆ ئەمە کەس دەرك عیلمی حەق ئەکات

بەعضێ بـــــــە موتڵەق نووسیاگە

قەیدی لەعیلمی حەقدا کریــــــــاگە

(هذا سعید)کەچـــــــــی (قد یشقی)

(ذا شقي)کەچــــــــــی(یسعد و یرقی)

یانی: بۆ ئەوەی ئەو فریشتانەی کە چاویان بە لەوحولمەحفوز ئەکەوێ تەواوی راستیەکانیان دەربارەی زانیاری خوا بـۆ دەرنەکەوێت، لەسەر لەوحی مەحوو ئیسپات هەندێ لە شتەکان بەڕەها نووسـراون کەچـی لـەعیلمی خـوادا قەیـدو مەرجی هەیە، بۆنمونە: لەو لەوحی مەحوو ئیسپاتەدا نووسراوە: (هذا سعید)، ئەمە بەختیارو کامەرانە بە رەهایی و بێ مەرج، لەهەمان کاتدا لەعیلمی خوادا ئەو مەرجەی بۆ دانراوە کە ئەبێ ئەمەو ئەوە بکـات، یـان ئەمـەو ئـەوە نەکات، یان بۆنمونە نووسراوە:(ذا شقي) ئەمە بەدبەخت و ناکامەرانە، ئەمیش هەر بەبێ قەیدو مـەرج، لەهـەمان کاتدا لەعیلمی خوادا ئەو مەرجەی بۆ دانراوە کە ئەبێ ئەمەو ئەوە بکات، یان ئەمەو ئەوە نەکات، جائەگـەر ئـەو مەرجانە هاتەدی ئەوە کارەکەش دێتەدی، ئەگەر نا ئەوە ئەو کـارە ڕوونـادات و پێچـەوانەکەی ڕوودەدات، بۆیـە ئەفەرموێ: (هذا سعید)کەچـــــــــی (قد یشقی)......(ذا شقي) کەچـــــــــی ( یسعد و یرقی)..

[2] هەندێ لـەزانایان ئەوەنـدە زیادەڕۆییـان کـردووە لەمـەدا تەنانـەت پێشنیاریانکردووە کـە لـە ئیعرابکردنیشدا وشەی"فاعل=بکەر" بسڕنەوەو لە زانستی نەحودا لایبەن و هـەڵیبگرن! چـونکە فاعیـل هەرخوایـە، تـا ئێسـتاش لەهەندێ حوجرەدا فەقێ وانێرنەکرێت کە ووتی ئەوە فاعیلە لەگەڵیدا بڵێت: فاعیـل هـەر خوایـە! لەکاتێکـدا ئـەوە جگە لەجۆرێك لە ئیسراف و زیادەڕۆیی و نەراستیشدا جۆرێك لەحاڵینەبوون نەبێت هیچی تر نیە، چونکە کە خـوای گەورە ئەفەرموێ"فما بکم من نعمة فمن الله" هەروەك ئەوە وایە کە ئەفەرموێ"فما تشاءون الا ان یشاءالله" چۆن

ئیرادەی خوا ئەکەن لە کاری عەبداو واگومان ئەبەن کە ئەگەر دەخالەت و ئیرادەی خوا بۆ کاری عەبد بسەلمێنن ئەوە زوڵم و ستەمیان داوەتە پاڵ خواو نابێ خوا دەخالەتی هەبێت لەکاری عەبدا چونکە عەبد ئازادو خاوەن ئیختیارە!، بەڵام راست ئەوەیە کە خوای گەورە چۆن ئیرادەو کاری سەربەخۆی بۆ خۆی سەلماندووە هەرواش ئیرادەی سەربەخۆو کاری سەربەخۆی داوەتە پاڵ عەبدەکانی و کردوونی بەخاوەنی ئیرادەو کارەکانی خۆیان، وەك ئەفەرموێ:

- " لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ"،
- "وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا"،
- "لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا"،
- " إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ"،
- "وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا فَقُلْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ أَنَّهُ مَنْ عَمِلَ مِنْكُمْ سُوءًا بِجَهَالَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٥٤) وَكَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ الْمُجْرِمِينَ (٥٥)"،
- " مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٩٧)"
- "وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ"،وە هەروەها، لەم ئایەتانەوە دەرئەکەوێت کە مرۆڤ خۆی کارەکان ئەکات و خۆی خاوەنێتی، مرۆڤ خاوەنی ئیرادەی خۆیەتی و

---

ئەمیان نەفی مەشیئەتی عەبد بە مرتلەق ناکات ئەویشیان نەفی بوونی ئەولیای نیعمەتی ئەم یان ئەو بەموتڵەق ناکات، رەزای خوا لەنێین عەبباس بێت کە ئەیفەرموو" مامن عام الا وقد خصص"، دەقێکی گشتی نیە تایبەت نەکرابێتەوە، سەیری کتێبی"منهج الاشاعرة في العقيدة، سفر بن عبدالرحمن الحوالي"بکە بۆ ئەم باسە.

خۆی بەکاریئەهێنێت، بەلاّم ئەوەندە هەیە ئیرادەی خواو کاری خوا راناوەستێ لەسەر ئیزنی عەبدەکانی، بەلاّم ئیرادەو کاری عەبد راوەستاوە لەسەر ئیزنی خوا، وەك ئەفەرموێ:"مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَنْ نُرِيدُ"، ئەمە یانی ئەوە: خوا پێویستی بە ئیزنی عەبد نییە بۆ کارێك بیکات، یان کەس ناتوانێ کارێك و بریارێکی خوا پەکبخات، بەلاّم عەبد پێویستی بە ئیزنی خوا هەیە بۆ کارێك و خوا ئەتوانێ کاری عەبد پەکبخات ئەگەر ویستی، وەك ئەفەرموێ:" وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ"خوا بریارئەدات و حوکم ئەکات کەس ناتوانێ پەرچ لەبەردەم حوکمی خوادا دابنێ..هەروەها عەبد پێویستی بەهاوکاری و پشتیوانی خوا هەیە تا سەرکەوتوبێت لەکارەکانیداو دووربێت لەبەلاّو نەخۆشی و ناخۆشی ،بەلاّم خوا پێویستی بەعەبد نییەو بێمنەتە لەعەبدەکانی..وەك خوای گەورە ئەفەرموێ:(قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ).. بلێ: من بۆ خۆیشم ناتوانم هیچ جۆرە سوودێك یان زیانێك دەستەبەر بکەم ئەگەر خوا نەیەوێت ئەوە ببێت، خۆ ئەگەر نادیارم بزانیایە ئەوە ئیشی چاکی زۆرم ئەکردو هیچ نارەحەتییەکم بەسەردا نەئەهات، من هیچ نیم ئەوەنەبێت کە ترسێنەرو مژدەدەرم بۆ گەلێك کە بروابهێنن.

کەواتە نکولیکردن لە ویستی راستەقینەو کاری راستەقینەی عەبد ستەمدانە پاڵ خوای تێدایە-سبحانەو تعالی-، نکولیکردنیش لەویستی راستەقینەی خواو کاری راستەقینەی خواو دەخالەتی لەویست و کاری عەبددا نەتوانین و دەستەوسانیدانە پاڵ خوای تێدایە-سبحانەوتعالی-، هەردوو بارەکەش

هەڵەیەو "بیرۆکەی نیزن" چارەسەری هەموو ئەو ئیشکالانە ئەکات لەم مەسەلەی قەزاو قەدەرەدا وەك لە پێشەوە روونمانکردەوە، سوپاس بۆ خوا..

رەحمەتی خواش لەمەولەوی شاعیر بێت کە ئەفەرموێ:

(قـــــوم افرطوا، قوم فـــــرّطوا

أُذنُهم من حق، هـــــلاّ قـــــرّطوا؟)

جـــــەبری بێحاڵ و قەدەریی مەجوس

ئەو بۆ خوێنخۆرو ئەم بۆ سرِوان جوس

بـــــابێین (لەبەن)بین ئەما نەك دەمی

(نخـــــــــرج من بین فرث و دم)

نەوەك لادێی نەوەك شاری بـــــــین

خالص بین سائیغ لەبۆ (شاریبـــــین)

افرطوا: لە (ئیفراط)ەوە هاتووە، واتە: ئیسراف و زیادەڕۆیی، فرّطوا: لە(تە فریط)ەوە هاتووە، واتە: کەمتەرخەمی و هەوڵنەدان، موسڵمان ئەبێ لەنێوان (ئیفراط) و (تە فریط)دا بێت، نە ئیسراف بکات و نە کەمتەرخەم بێت، جەبری: ئەوانەن کە مرۆڤ بە ئیجبارکراو ئەزانن و وەك دارو بەرد سەیری ئەکەن، قەدەری: ئەوانەن کەبڕوایان بەقەدەر نیەو مرۆڤ بە نیوەخوایەك سەیرئەکەن، مەجوس: ئاگرپەرست، سرِوان: یانی ریخ: ئەو پیساییەیە کە لەورگی ئاژەڵدایەو پاش سەربرِین فرێئەدرێت و ورگەکەی لێ پاکئەکرێتەوەو ئەکرێت بەگیپەو ئەخورێت، (لەبەن)واتە: شیر، شاریبین: یانی (شاربین) ، خوای گەورە ئەفەرموێ:(وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ)، واتە: ئێوە لەئاژەڵاندا پەندو ئامۆژگارییەکی باشتان

دەستنەکەوێت، ئێمە لەسکی ئەو ئاژەلانەوە لەنێوان سروان (پیسایی)و خوێنەکەیەوە شیرێکی خالص و پالفتەدەردەهێنین کە ئاسان بخورێتەوەو دەرخواردی ئەوانە ئەدەین کە شلەخۆرن..

کورتەی ماناى بەیتەکان، واتە: قەومێك لەم مەسەلەی قەزاو قەدەرەدا زۆر زیادەڕۆییانکردووەو قەومێکی تر زۆر کەمتەرخەمییان کردووەو گوێیان نەگرتووە بۆ حەق، کە نەتەبوو وابکەن بەلکو ئەبوو، قەی زانایانیانی شارەزاو موعتەبەریان وەك گوارە بکردایەتە گوێیان و نەلایەنی جەبریەکانیان بگرتایەو نەلایەنی قەدەریەکانیشیان بگرتایە کە لە ئاگرپەرستان ئەچن و بڕوایان بە زیاتر لەخولقێنەرێك هەیە، جا ئەلێ: وەرن با ئێمە وەك شیر لەنێوان ئەو خوێنخۆرو ئەو(...)خۆرانەدا بێینەدەرەوە!با نە وەکو لادێی بین نە وەکو شاریش بین، وەك لادێی نەبین ئەوەندە شیرەکە بکولێنین شتێکی وای لێنەمێنێتەوەو وەك شاریش نەبین کە ئەوەندە ئاو ئەکەنە ناو شیرەکە لەزەتی تێدا ناهێلن..با ڕێبازی ئێمە لەعەیب بەدوور بێت و پاك بێت، وەك شیرێکی ساف بێت و ئاسان بخورێتەوەو سوودی لێوەربگیرێت..

## ئایا قەدەر سابیتەو ناگۆڕێت؟

ئایا قەدەر سابیتەو ناگۆڕێت، یان کارو ئیرادەی عەبدو ئیزنی خوا هاوزەمان، یان مەشیئەت و ئیرادەی خوا بەتەنیا ئەتوانێ قەدەر بگۆڕێت؟
خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێ:( يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ (٣٩) يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ (٣٩) یانی: خوا کە ویستی شت ئەسڕێتەوەو جێگریشی ئەکات و سەرچاوەی هەموو نووسراوەکانیش هەر لای ئەوە..

زانایان لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەڵێن: بەڵێ ئەو قەدەرانەی کە هەن عەبد ئیزنی ئەوەی پێدراوە کە هەوڵ بۆ گۆڕینیان بدات و ئەو سونەن و سیستەمانە کەشفبکات کە ئەو قەدەرانەی پێ بگۆڕێت، ئیتر ئەو شتانە بەلاو موسیبەتێك بن یان گومڕایی و هیدایەت بن یان رزق و بێڕزقی بن یان دەرچوون و دەرنەچوون بن یان سەرکەوتن و دواکەوتن بن یان دوعاکردن بێت بۆ لەناوچوونی زاڵمێك..هتد، بۆنمونە: بنەبڕکردنی نەخۆشی بە کەشفکردنی چارەسەرەکان و بەکارهێنانیان، خۆرزگارکردن لە هەژاری بە گرتنەبەری رێوشوێنی کاسبی و کەسابەتی زانستیانە، یان خۆرزگارکردن لە جەهل و نەفامی بەگرتنەبەری رێوشوێنی زانست و زانیاری، یان خۆقوتارکردن لە سەرکزی و بەجێماوی بەگرتنەبەری رێبازی شۆڕشکردن و هەوڵدان بۆ دەسەلاتگرتنەدەست ...وە هەروەها، دۆزینەوەی ئەو رێساو سونەنانە کە ئەو واقیع و قەدەرانە ئەگۆڕن بۆ چاکترو باشترو گرتنەبەریان -ئەگەر خوا ئیزن بدات- ئەو قەدەرو بارودۆخانە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێك ئەگۆڕرێن، بۆ مامەڵکردنیش لەگەڵ ئەم چەمکەدا زانایان دوو زاراوە بەکار ئەبەن: قەزای موبرەم، و قەزای غەیرە موبرەم، خوا ئەو قەدەرانە ئەگۆڕێت هەرکاتێك ویستی، عەبدیش ئەتوانێ

ئەو قەدەرانە بگۆڕێت هەر کاتێك ویستی،-بەڵام ئەگەر خوا ئیزن بدات-، وەك ئەفەرموێ: (وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ).[1]

ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەیداو لە تەفسیری ئایەتی( يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ) دا ئەفەرموێ:

(...قال مجاهد:{ يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ } إلا الحياة والموت، والشقاء والسعادة، فإنهما لا يتغيران.وقال منصور: سألت مجاهدا فقلت: أرأيت دعاء أحدنا يقول: اللهم، إن كان اسمي في السعداء فأثبته فيهم، وإن كان في الأشقياء فامحه عنهم واجعله في السعداء. فقال: حسن. ثم لقيته بعد ذلك بحول أو أكثر، فسألته عن ذلك، فقال: { إِنَّا أَنزلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنْذِرِينَ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ }،قال: يقضي في ليلة القدر ما يكون في السَّنة من رزق أو مصيبة، ثم يقدم

---

[1] بە پێی دەیان ئایەت و دەیان حەدیسی پێغەمبەر(صلى الله عليه و اله وسلم) بە دوعاکردن و هەوڵدان و صەدەقەکردن و چاکەکردن و سیلەی رەحم .... قەدەرەکان ئەتوانرێت بگۆڕرێن، بۆ نمونە پێغەمبەر(صلى الله عليه و اله وسلم)ئەفەرموێ: (إِنَّ الدُّعَاءَ يَنْفَعُ مِمَّا نزل ومِمَّا لَمْ يَنْزِلْ فَعَلَيْكُمْ عِبَادَ اللَّهِ بِالدُّعَاءِ).وفي رواية : ((مَا سُئِلَ اللَّهُ شَيْئاً أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يُسْأَلَ الْعَافِيَةَ.)).أَخْرَجَ الترمذي "٣٥١٤": "لاَ يَرُدُّ الْقَضَاءَ إِلاَّ الدُّعَاءُ، وَلاَ يَزِيدُ فِي الْعُمُرِ إِلاَّ الْبِرّ".موبارەکفوری لە کتێبی" تحفة الاحوذي" یەدا ئەڵێ: (لا يرد القضاء إلا الدعاء) القضاء هو الأمر المقدر وتأويل الحديث أنه إن أراد بالقضاء ما يخافه العبد من نزول المكروه به ويتوقاه فإذا وفق للدعاء دفعه الله عنه فتسميته قضاء مجاز على حسب ما يعتقده المتوقى عنه، يوضحه قوله صلى الله عليه وسلم في الرقى: هو من قدر الله. وقد أمر بالتداوي والدعاء مع أن المقدور كائن لخفائه على الناس وجوداً وعدماً ولما بلغ عمر الشام وقيل له إن بها طاعوناً رجع، فقال أبو عبيدة: أتفر من القضاء يا أمير المؤمنين؟ فقال: لو غيرك قالها يا أبا عبيدة نعم نفر من قضاء الله إلى قضاء الله. أو أراد برد القضاء إن كان المراد حقيقته تهوينه وتيسير الأمر حتى كأنه لم ينزل، يؤيده ما أخرجه الترمذي من حديث ابن عمر أن الدعاء ينفع مما نزل ومما لم ينزل. وقيل: الدعاء كالترس والبلاء كالسهم والقضاء أمر مبهم مقدر في الأزل (ولا يزيد في العمر) بضم الميم وتسكن (إلا البر) بكسر الباء وهو الإحسان والطاعة. قيل يزاد حقيقة. قال تعالى: {وما يعمر من معمر ولا ينقص من عمره إلا في كتاب} وقال: "يمحو الله ما يشاء ويثبت وعنده أم الكتاب"..

ما يشاء ويؤخر ما يشاء، فأما كتاب الشقاوة والسعادة فهو ثابت لا يُغير..ومعنى هذه الأقوال: أن الأقدار ينسخ الله ما يشاء منها، ويثبت منها ما يشاء، وقد يستأنس لهذا القول بما رواه الإمام أحمدعن ثَوْبَان قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: "إن الرجل ليحرم الرزق بالذنب يُصيبه، ولا يرد القَدَر إلا الدعاء، ولا يزيد في العمر إلا البر". ورواه النسائي وابن ماجه، من حديث سفيان الثوري، به .

وثبت في الصحيح أن صلة الرحم تزيد في العمر وفي الحديث الآخر: "إن الدعاء والقضاء ليعتلجان بين السماء والأرض" .

بەلاَم شەوكانی فراوانتر بیرئەكاتەوە لەپرسەكەو لەتەفسیرەكەیدا ئەفەرموێ: (وظاهر النظم القرآني العموم في كل شيء مما في الكتاب، فيمحو ما يشاء محوه من شقاوة أو سعادة أو رزق أو عمر، أو خير أو شرّ، ويبدل هذا بهذا، ويجعل هذا مكان هذا { لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْئَلُونَ } ﴿ الأنبياء : ٢٣ ﴾ وإلى هذا ذهب عمر بن الخطاب، وعبد الله بن مسعود، وابن عباس، وأبو وائل، وقتادة، والضحاك، وابن جريج وغيرهم .

شێخ ئالوسی بەرەحمەت بێت لێكۆڵینەوەیەكی زۆر جوان ئەكات بۆ ئەم بابەتەو ژمارەیەكی زۆر بەڵگەی نەقلی و عەقلی باسئەكات لەسەر ئەوەی كە قەدەرو قەزاكان قابیلی ئەوەن كە بە هەوڵ و تێكۆشانی عەبدەكان گۆڕانیان بەسەردا بێت، جاپاش ئەوەی كەڕای زانا كلاسیكیەكان باسئەكات و رەخنەیان لێئەگرێت، ئەفەرموێ:"..كاتی خۆی لەكتێبێكدا كە هەندێ لەزانا بەرێزەكان دایاننابوو دەستنووسێكی لام هەبوو لەرووداوەكەی بەغداددا تیاچوو تایبەت بەم بابەتە نووسرابوو، لەوێدا وترابوو: هیچ شتێك نیە كە ئەگەری ئەوەی ئەبێت بگۆڕردرێت و

لەبری ئەو شتێکی تر دابنرێت، تەنانەت قەزاو قەدەرە ئەزەلییەکانیش..
بەڵگەیەکی زۆریشی بۆ ئەو قسەیە هێنابوویەوە وەك:

- لەفەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا(صلی الله علیەوالەوسلم) هاتووە کە لەقونوتدا دوعاینەکردو ئەیفەرموو:« وقني شر ما قضيت»، بمپارێزە لە خراپەی ئەو بڕیارانەی داوتە، دەی ئەم دوعایەی پێغەمبەر ئەوەی تێدایە کە دروستە دوعا بکەی بۆ گۆڕینی قەدەری ئەزەلی و ئەگەر ئەو قەدەرانەش هەڵنەگرن بگۆڕرێن ئەوە ئەو دوعایە دروست نەئەبوو پێغەمبەر بیکردایە!
- بەڵگەیەکی تر: حەدیسی تەراویح بەصەحیحی هاتووە کەپێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم) نەڕۆیشت بۆ مزگەوت هەرچەندە خەڵکیش هەموو کۆبووبوونەوە، پاساویشی بەوە هێنایەوە کە ئەترسێت ئەو نوێژەیان لەسەر فەرز ببێت، وەك فەرمووی: "خشيت أن تفرض عليكم فتعجزوا عنها " دەی هیچ مانایەك بۆ ئەو ترسەی پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم) نامێنێت ئەگەر قەدەری ئەزەلی ئەگەری گۆڕینی نەبێت، چونکە لەراستیدا ئەگەر تەراویح قەدەرکرابێت لەپێشەوەو فەرزکرابێت ئەوە هەرئەبێ فەرزبێت و خۆئەگەر قەدەر فەرزی نەکردبێت ئەوە محاڵە فەرز ببێت، هەروەها ئەو حەدیسە صەحیحەش هەیە کە کاتێك بەپێغەمبەر رائەگەیەنرێت خوا پەنجا نوێژی لەسەر ئوممەتەکەت داناوەو ئەویش"صەلات و سەلامی خوای لێبێت" لەسەر پێشنیاری گەورەمان موسا"سەلامی خوای لێبێت" ئەگەڕێتەوە بۆ لای خواو داوای لێئەکات کەپەنجا نوێژەکەی بۆ بکات بەپێنج نوێژ، جا ئەگەر پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم)بڕوای وانەبوایە کە قەدەرەکان ئەگەری گۆڕینیان هەیە بەدوعا یان

بەتکا ئەوە مانایەك نامێنێتەوە بۆ ئەو كارو تكایەی پێغەمبەر(صلى الله عليەوالەوسلم).

- یەكێكی تر لەو بەڵگانە ئەو حەدیسە صەحیحەی پێغەمبەرە(صلى الله عليەوالەوسلم)كە ئەیگێڕنەوەلێی: لەكاتی هەڵكردنی رەشەبادا ڕەنگی ئەگۆڕاو و ڕێنەكەوت كە ئەو شەوەش نەئەخەوت و ئەیفەرموو:" أخشى أن تقوم الساعة "[1]، ئەترسم قیامەت هەستێت! ئەگەر پێغەمبەر(صلى الله عليەوالەوسلم) بڕوای وانەبوایە كە قەدەرەكانی خوا ئەگونجێت گۆڕانیان بەسەردابێت و شتی تر بچێتە جێگەیان ئەو ترسەی هیچ پاساوێكی نەبوو، چونكە خۆ ئەو ئەیزانی پێش هاتنی قیامەت زۆر شتی تر هەیە ئەبێ ڕووبدەن وەك: هاتنی مەهدی و هاتنەخوارەوەی حەزرەتی عیساو دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج و هەلاتنی خۆر لەخۆرئاوەو... ئەوانی تریش..

- ئەوەش هەر بەڵگەیەكی روونە كە ئەو كەسانەی مژدەی بەهەشتیان پێدرابوو لەسەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليەوالەوسلم) هەموو ئەترسان لەوەی بخرێنە ناو ئاگرو هەر یەكەیان دەیان ترسیان لەو بارەوە لێئەگێڕنەوە، هەیانبوو ئەیووت:"ليت أمي لم تلدني"، ئیمامی عومەریش ئەیفەرموو:" لو نادى مناد كل الناس في الجنة إلا واحداً لظننت أني ذلك الواحد"، دەی ئەگەر لە دیدی ئەم خواپێداوانەدا شتەكە وابوایە كە قەدەرەكان گۆڕانیان بەسەردا نایەت، ئەو قەو ترسانە هیچ مانایەكیان تێدا نامێنێت و ترسی بێ جێن!-دووربێت لەوان-.

[1] جامع لطائف التفسير،عبد الرحمن بن محمد القماش، إمام وخطيب بدولة الإمارات العربية(٢٣/٣٠٤).هەروەها: روح المعاني في تفسير القران العظيم والسبع المثاني، محمود الألوسي(١٣/١٦٩).

• بەڵگەیەکی تر ئەوەیە ئەگەر ئەوەی دوعــا ئــەکات بــڕوای وانــەبێت کــە قەدەرەکان ئەگونجێ بگۆڕێن و شتی تر بچێتە جێگەیانْ ئەوە ئەو دوعاو پاڕانــەوەو لالأنەوەی لەخوا -کە نەخۆشەکەی بۆ چاکبکاتەوە یان رزقی بــۆ زیــاد بکــات یــان منالّەکەی زاناو سەرکەوتوو بکات یان لەبەلاّو زیانی ئەم و ئەو بیپارێزێــت- هــیچ مانایەکی نەئەماو ئەو کارەی ئەبوویــە گاڵتــەجاڕی و خۆفریــودان، چــونکە داوای شتێکی محالّ ئەکات کە قابیلی ئەوە نییە دەستکاری بکرێت!!

• تەنانەت پێغەمبەر ئەو کەسانە کە لەژیاندا بێئومێد بوون فێرئەکات کە دوعا بکەن ئەگەر مــردن خێرتــرە بۆیــان داوابکــەن خــوا زووتــر بیانمرێنێــت، وەك ئەفەرموێت:(لایَتَمَنَّیَنَّ أَحَدُکُمُ الْمَوْتَ مِنْ ضُر أَصَابَهُ فَإِنْ کَانَ لابُـدَّ فَـاعِلا فَلْيَقُـلِ : اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَاکَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي).[1]

جا لەڕاستیدا ئەگەر ئەو دوعاکردنە گاڵتەجاڕی بێت و داواکردنی شتی محــالّ بێــت ئەوە نە پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم)موسڵمانان فێری ئەو دوعایە ئــەکات و نەئەو دوعایەش دروستە مرۆڤی موسڵمان بیکات.

• شێخ ئالوسی ئەڵێت: هی وا هەیە لێرەدا ئەڵێ: دوعاکردن بــۆ دەربــڕینی عەبدایەتی و کزۆڵی خۆتەو هەر ئەوەندە سوود بەســە بــۆ ئــەوەی بیکــەیت! بــەلاّم لەڕاســتیدا ئــەوە پێچــەوانەی ئــەو ئایەتەیــە کەئەفــەرموێ:(ادعـونی أسْـتَجِبْ لَكُمْ)،(غـافر:٦٠)، ئێــوە هــاوارم لێبکــەن منــیش وەلاّمتانئەدەمــەوە، هــەروەها پێچەوانەی ئەو فەرموودە صەحیحەی پێغەمبەریشە(صلی الله علیەوالەوسلم) کــە ئیبن عەبباس لە پێغەمبەرەوە ئەیگێڕێتەوە کە ئەفەرموێ:(لا ينفع الحذر من القـدر ولكن الله تعالى يمحو بالـدعاء مـا يشـاء مـن القـدر)، حــەزەرکردن کــەڵکی نییــە

[1] الاداب ،البيهقي،باب: المصيبة بالاولاد.

لەکاتی قەدەردا بەلاّم خوا بەهۆی نزاوە هەر قەدەرێکی بوێت ئەیسڕێتەوە، ئیبن مەردەوەیهی و ئیبن عەساکریش لە حەزرەتی عەلیەوە ئەگێڕنەوە کە پرسیاری لە پێغەمبەر(صلى الله عليەوالەوسلم)کرد دەربارەی ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێ: { يَمْحُو اللهُ مَا يَشَاءُ }، پێغەمبەر(صلى الله عليە والەوسلم) فەرمووی: "لأقرن عينك بتفسيرها ولأقرن عين أمتي بعدي بتفسيرها، الصدقة على وجهها وبر الوالدين واصطناع المعروف محول الشقاء سعادة ويزيد في العمر و يقي مصارع السوء"، چاوی تۆو چاوی ئوممەتەکەشم بەتەفسیری دروستی ئەو ئایەتە گەشنەکەمەوە: خێرکردن وەك خۆی و گوێڕایەڵی و چاکە لەگەڵ باوك و دایکداو چاکە دروستکردن ئەمانە بەدبەختی ئەگۆڕن بۆ کامەرانی و تەمەن زیاد ئەکەن و لە مردنی خراپیش مرۆڤ ئەپارێزن، دەی ئەم شتانە ناچنە عەقڵەوە وابن ئەگەر قەدەر نەگۆڕ بێت و ئەگەری گۆڕینی نەبێت.

- خوای گەورە ئەفەرموێ: (لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ) (إبراهيم: ٧).واتە: ئەگەر سوپاس بکەن ئەوە پەیمان بێت منیش بۆتانی زیادئەکەم.جا ئەگەر شتەکان زیادو کەم نەکەن ئەم پەیمانە چییە خوا ئەیدان بەبەندەکانی و بە مەنتیقی ئەوانە بێت کە بڕوایان بەوە نییە قەدەرەکان ئەگۆڕرێن ئەوە ئەبوو-بۆنمونە- خوا بیفەرموایە: ئەگەر سوپاس بکەن ئەوە ئەوەی بۆم داناون ئەتاندەمێ و لێتانی ناگرمەوە..

جگە لەم بەڵگانە حەدیس و ئاسارێکی زۆر هاتووە کە ئەوە ئەسەلمێنن لەتوانادا هەیە کە قەدەرەکان بگۆڕرێن بە هەوڵ و کۆشش و دوعاو صەدەقەکردن و تکاکردن لەخوای پەروەردگارو صیلەی ڕەحم و..وەك پێغەمبەر(صلى الله عليە والەوسلم) لە حەجی ماڵئاواییداو بەسەر وشترێکی سووری گوێبڕاوەوە بوو

ئەیفەرموو:( أَيُّهَا النَّاسُ، تَعَلَّمُنَ إِنَّمَ الأَيْدِي ثَلاثَةٌ يَدُ اللهِ هِيَ الْعُلْيَا، وَيَدُ الْمُعْطِي الْوُسْطَى، وَيَدُ الْمُعْطَى السُّفْلَى، فَتَعَفَّفُوا وَلَوْ بِحزَمِ الْحَطَبِ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ)[1] خەڵكینە! ئەوە باش بزانن كە دەستەكان سێ جۆرن: دەستی خوا كە لەسەروو هەموو دەستەكانەوەیە، دەستی كەسی بەخشندە كە لە ناوەڕاستدایە، دەستی وەرگر كە لەخوارەوەیە، كەواتە خۆتان دەوڵەمەند بكەن ئەگەر بە دارفرۆشیش بووە. پاشان دەستەكانی بۆ ئاسمان بەرزكردەوەو فەرمووی: پەروەردگاری خۆشەویست! ئایا (پەیامەكەی تۆم) گەیاند؟..جا ئەگەر پێغەمبەر(صلى الله علیه والەوسلم)بڕوای بەوە نەبووبێت كە رزق بە هەوڵ و كاسبیكردن نەگۆڕێت و دەوڵەمەندی دروستئەكات چۆن ئەوە ئەفەرمویت و ناویشی ئینەنێت پەیامی خوا؟!

یان كە پێغەمبەری خوا(صلى الله علیەوالەوسلم)، موسڵمان فێری نوێژی ئیستیخارە ئەكات بۆ چییە؟ ئەگەر بۆ ئەوە نەبێت كە ئەو قەدەرانە ئەتوانرێت بگۆڕرێن و تكا لەخوا بكرێت بۆ ئەوەی ئەو قەدەرانە دەستكاری بكات بۆ ئەم، نوێژی ئیستیخارە بریتییە لەو نوێژەی دانراوە بۆ موسڵمان كاتێك ئەیەوێت كارێك بكات و كەچی نازانێ خێری تێدایە یان شەڕی تێدایە، لەو كاتەدا سوونەتە بۆی كە دوو ركات نوێژ بكات و ئەم دوعایە بخوێنێت كە پێغەمبەر(صلى الله علیەوالەوسلم)صەحابە بەڕێزەكانی خۆیی فێركردووە بیخوێنن كە ئەمەیە:(اللهم إني أستخيرك بعلمك، واستقدرك بقدرتك، وأسألك من فضلك العظيم، فإنك تقدر ولا أقدر، وتعلم ولا أعلم، وأنت علام الغيوب. اللهم إن كنت تعلم أن هذا الأمر - ويسمي حاجته - خير لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري فاقدره لي ، ويسره لي ،

---

[1] إتحاف الخيرة المهرة بزوائد المسانيد العشرة، أحمد بن أبي بكر بن إسماعيل البوصيري.

ثم بارك لي فيه . وإن كنت تعلم أن هذا الأمر شر لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري عاجله وآجله فاصرفه عني واصرفني عنه ، واقدر لي الخير حيث كان ثم أرضني به)) (البخاري ١١٦٢)، واته: خوای خۆشەویست! من بەهۆی زانستی تۆوە داوای خێرت لێدەکەم، بەهۆی دەسەڵاتی تۆوە داوای توانات لێدەکەم، داوای هەندێ لەو چاکە گەورەی خۆتت لێئەکەم، دڵنیام کە تۆ توانات هەیەو من نیمە، تۆ ئەیزانی و من نایزانم، تۆ زانای بەهەموو نادیارەکان، خوای خۆشەویست! ئەگەر تۆ ئەزانی ئەم ئیشە-ناوی ئیشەکە ئەهێنێت-خێرە بۆ دین و ژیان و پاشەرۆژی کارەکەم ئەوە بۆم ڕێکبخەو، بۆمئاسان بکەو بەرەکەتی تێبخە، ئەگەر تۆ ئەزانی ئەم ئیشە خراپە بۆ دین و ژیان و ئێستاو پاشەرۆژی کارەکەم ئەوە لێم دووربخەرەوەو ئەویش لەمن دوور بخەرەوە، خێرم بۆ بڕیار بدە لەهەر کوێدابێ و پاشان ڕازیشم بکە بەو شتە.

لەم شەرح و تەفصیلە زۆرەی زانایانەوە لەناو صەحابەو تابیعین و پێشەوانی دینەوە ئەگەینە ئەوەی کە قەدەرەکان و قەزاکانیش بە هەوڵ و بە دوعای عەبد گۆڕانیان بەسەردا دێت -ئەگەر خوا ئیزن بدات- و بەوەش ئەو ناکۆکیانە نامێنێت لەنێوان ئەو دەقانەدا کەئاماژە بۆ ئەگۆڕینی قەدەرەکان ئەکەن یان باسی ئەوە ئەکەن: ئایا ئەگەر خوا شتێکی ئەویست ئەبێت یان نابێت، ئایا خراپە کەڕووئەدات خوا پێی خۆشە یان پێیناخۆشە..

## وەلامی چەند گومانێك

ئەم بابەتی قەدەرو قەزایە چەند روونی بکەیتەوە هەر بەشی ئەوە ناڕوونی تێدا ئەمێنێتەوە کەکەسانی دەروون نەخۆش یان کەم عیلم یان ناحەز بەدین هەندێ گومان بخاتە ناو باسەکە، هۆکەش ئەوەیە کە قەدەرو قەزا لە رووبەکیەوە بریتییە لەدرێژەی ئەو نەخشەو سیاسەتەی کەخوا دایڕێژاوە بۆبەڕێوەبردن و هەڵسووڕاندنی ئەم بوونە فراوانە، لەلایەکیشەوە پەیوەندە بەم مرۆڤەو چارەنووسی ئەم مرۆڤەوە، بۆیە ئاساییە کە مرۆڤ نەتوانێت لە درێژەی ئەو نەخشەو سیاسەتانە حاڵی ببێت و تێیانبگات، وەك چۆن لەدرێژەی نەخشەو سیاسەتی کەسێکی دەوڵەمەند یان سیاسەتمەدار یان حکومەتێك یان نەخشەو سیاسەتی دەوڵەتێکی گەورە یان بچوك بەتەواوەتی حاڵی ببێت و پرسیاری نەمێنێ، ئەوەتا ئیمامی تەحاوی لەم بابەتەدا ئەفەرموێ:" وأصل القدر سر الله في خلقه لم يطلع عليه ملك مقرب، ولا نبي مرسل، والتعمق والنظر في ذلك ذريعة الخِذلان وسلّم الحرمان، ودرجة الطغيان.
فالحذر كل الحذر من ذلك نظراً وفكراً ووسوسة، فإن الله طوى علمه عن أنامه، ونهاهم عن مرامه، كما قال تَعَالَى في كتابه: لا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿الأنبياء:٢٣﴾، فمن سأل لِمَ فعل؟ فقد رد حكم الكتاب، ومن رد حكم الكتاب كَانَ من الكافرين"..

**گومانی یەکەم**: ئایا خوا ئاگای لەداهاتوو هەیە کە چی ئەبێت و چی نابێت، کام نەخشە سەرئەگرێت و کام نەخشە سەرناگرێت؟

ئەڵێین: بەڵێ خوای گەورە وەك چۆن ئاگاداری رابردووەو ئاگاداری ئێستایە هەرواش ئاگاداری داهاتووە کە چی ئەبێت و چی نابێت و داهاتووی ئاسمان و زەمین و مرۆڤ و گشت خولقاوەکانی تر ئەزانێ و ئاگای لێیەتی، چونکە مرۆڤ کەنازانێ داهاتوو

چی نەبێت ئەوە بەڵگەی سنوورداری زانیاریەکانیەتی و کەموکورتی و نوقسانیشە بۆی، بەڵام خوا سنوور نیە بۆ زانیاریەکانی و نابێ خوا ئەو نوقسانیەی تێدا بێت، هەر مرۆڤێك پێشبینیەکانی بۆ داهاتوو زۆرتر دروست دەربچێت ئەوە نیشانەی زانابوون و کامڵبوونی زیاترە تێیداو هەرکەسیش پێشبینیەکانی وادەرنەچن ئەوە عەیبەیە تێیدا، نابێ خواش هەر وەك مرۆڤ بێت و شتەکان تا روونەدەن نەیزانێت و کە روویدا ئەو کاتە زانیاری بۆ دروست ببێت دەربارەی ئەو شتە[1]، خوای گەورە

---

[1] بەداخەوە پیاوێکی زانای وەك شێخ باباعەلی شێخ عومەری قەرەداغی لەسەر ئەو بیروبڕوایە کە شت تا روونەدات خوایش نایزانێ و کە روویدا ئەو کاتە ئەویش ئەیزانێت،( " القضاء والقدر في القران الكريم"، بابا علي الشيخ عمر القرداغي، ص١٧٦، لەبلاّوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر)، دیارە ئەمەش تۆزی فەلسەفەو عیلمی کەلامەو بەسەر بیرو دڵی ئەو پیاوەوە نیشتووەتەوە، خۆی لە چاوپێکەوتنێکدا دەربارەی خۆیی و مامۆستا پارەزانی ئەڵێ:( من لە هەڵەبجە فەقێ بووم کە پارەزانی هات بۆ مزگەوتی مەلا ساڵح و بووە فەقێ. ئەو کاتە شێخ عەزیز (گەلەنبەوی بورهانی) دەخوێندو لە هەموو هاوەڵەکانی زیرەکترو تێگەیشتووتر بوو. مامۆستا مەلا ساڵحیش دانییپادا دەناو، بەجیاواز لەوانی تر سەیری دەکرد: کە گەڕاینەوە سلێمانی لە مزگەوتی (شێخ مەحمود قەرەچیوار) یا لە (خوێخانە) دەمدی، چەند لاپەڕەیەکی (فتح القريب)و شەرحەکەیم لاخوێند، کە لەسەرەتای پەنجاکاندا دەستیدایە کاری ئایندۆستی و بێداری ئیسلامی، ئاگاداربووم مامۆستا نامەیەکی گلەیی بۆ یەکێ لە مەلاکانی سلێمانی نارد کە گوایە خوێندنگاکەی کردۆتە چەقی بلاّوکردنەوەی بێ دینی و ئیلحاد، توانی بەچەند فەقێیەك ئیمزای بکاو بینێرێ بۆ مەلاکە، من لەو کاتەدا لە خزمەت ئەو مەلایەدا دەمخوێند، ئاگاداربووم کە چەند کەوتبووە هەڵوێستێکی ناهەموارەوەو بەدرێژی هەیوانی مزگەوتەکەدا پیاسەی دەکردو بە منی دەگوت : فلاّنی کوڕم ئیمانی لە کێوی گوێژە ئەستوورترە ئەمان بە مولحیدی ئەزانن، بەڵام ڕۆژگار دەریخست کەبەقەدەر باڵی مێشوولەیەك ئیمانی نەبوو. پاشان شێخ بابا عەلی ئەڵێ:( لەوکاتەدا بەرگری لە ئیسلام و خۆبەستنەوە بە فەرمانەکانیەوە کارێکی گرنگ بوو، مامۆستا پارەزانیش رۆژ بەڕۆژو ساڵ بەساڵ بەرەو پێش دەڕۆیشت، تاوای لێهات گیانی خزمەتکردن بەئیسلام لەدڵیدا جێگیر بوو، وازی لەهەندێ لە زانیاریە کۆنەکان هێنا کە زۆربەی ژیانی تێدا بەسەر بردبوو، وەکو (مەنتیق)و چوار ساڵی ژیانی پیرۆزی لەگەڵ (بورهانی گەلەنبەوی) و (پەراوێزەکانی پێنجوێنی)دا تەواوکرد کە مەنتیق بوون، بەڵام مامۆستا وازی لێهێنان و ڕوویکردە تەفسیری قورئان و مێژووی ئیسلام و بابەتە نوێکانی بانگەوازی ئیسلامی، وەك کتێبەکانی (سەید قوتب و محەمەدی براو و ئەبو ئەعلای مەودودی)و کەسانی تر، مامۆستا سێ (تهافت الفلاسفە)ی هەبوو لەیەك بەرگدا کە هی (غەزالی و ئیبن روشدو خواجە زادە) بوون، زۆرم حەز لێدەکردن. ئەویش حەزی لە (الدستور الاسلامي)ی مەودودی و (تأريخ الدعوة الإسلامية)ی مەسعود ئەننەدەوی بوو، کە کۆکرابویەوە

ئەفەرمویێت: (وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ (٥٩)، کلیلەکانی نادیاری تەنیا لای خوان، ئەو نەبێت کەس نایانزانێت، ئاگای هەیە لەوانەی لەوشکانی و لەدەریادا هەن و گەڵایەك ناکەوێتەخوارەوە ئەو نەیزانێت و دانەوێڵەیەك نیە لەناو تاریکایی زەویدا بێت و ئەو نەیزانێت، نە وشك و نەتەڕێك نیەلە دەفتەرێکی ڕووندا نەبێت.

هەروەها ئەفەرموێ:(هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَاإِلَهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ)، هەروەها ئەفەرموێ:( وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ).

ئیمامی شافیعی ڕەحمەتی-خوای لێبێت- ئەفەرموێ:"ناظروا القدرية بالعلم، فإن أقروا به خصموا، وإن أنكروا كفروا"[1].

**گومانی دووەم:** ئایا خوا هەموو ئەو شتانەی کە لەداهاتوودا ڕوودەدەن تۆماریکردوون لای خۆی یان نا؟ لە وەڵامدا ئەبێ بڵێین: بەڵێ، هیچ ڕێگرێك نیە بۆ

لەیەك بەرگی بچوکدا، زۆر بە ئاسانی ئەو بەرگە بچوکەمان ئاڵوگۆڕکرد بەو بەرگە گەورە، هەردولامان بەئاواتی خۆمان گەیشتین!-جا مامۆستا شێخ بابا عەلی بۆ مێژوو- ئەڵێ:(ئاشکرایە ئاواتەکەی ئەو گەلێ پیرۆز بوو، ئەوەی منیش مەکەر خودا بۆخۆی بزانێ کە چینو چەندە فریان بە ئیسلامو بەوباوەڕی ئیسلامیەوە هەیە!!، لە پێشەکی کتێبی "ئیشکردن یان تەمەڵی، ژمارە(٢٥)ی کتێبە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی تیشك، وەرگێڕاوەو کورتکراوەتەوە.

[1] شرح الطحاوية في العقيدة السلفية، صدر الدين علي بن علي بن محمد بن أبي العز الحنفي، تحقيق أحمد محمد شاكر، یانی لەتەوەری-عیلم-دا موناقەشەی قەدەریەکان بکەن و لێیان بپرسن: ئایا خوا عیلمی بە ڕابردوو بەئێستاو بەداهاتوو هەیە یان هەروەك ئێمەیەو شت تاڕوونەدات نایزانێت! جائەگەر ئەوەیان سەلماند کە خوا عیلمی بە ڕابردوو بەئێستاو بەداهاتوو هەیە ئەوە ئەبەزن ، ئەگەر نکولیشیان لەوەکرد ئەوە کافرئەبن!، ئیمامی رازی وەك پەراوێزێك بۆ ئەم قسەی شافیعی ئەڵێ:(لو اجتمع العقلاء على ان يردوا على هذا الالزام بحرف واحد لما استطاعوا الا ان ياخذوا بقول غلاة القدرية انه تعالى لايعلم الاشياء قبل وقوعها،بڕوانە: المختار من كنوز السنة النبوية، د.محمد عبدالله الدراز، ص٢٤٣.

ئەوەی خوا ئەو زانیاریانەی خۆی تۆماربكات. چونكە هیچ كەسێك نـاتوانێ بڵـێ: خوایە ئەو شتانە تۆمار مەكە! یان هیچ كەس ناتوانێ بڵێ: خوایە ئەگەر تـۆ ئـەو شتانەت تۆمار كرد سەبارەت بە ئاسمانەكان و زەوی و مرۆڤەكان ئەوە ئـیتر زەوی و ئاسمانەكان و ئەوانەشی لەو ناوەدان ناچار نەبن كە پێڕەو لەو نووسراوەی تۆ بكەن و ئیتر ئیرادەو ئیختیارو عەقڵی خۆیان لەدەست ئەدەن! لەوەلآمدا ئەبێ بڵێین:

أ: كەس ناتوانێ رێگە لەخوا بگرێت كە ئەو زانیاریانەی خۆی دەربارەی داهـاتووی ئەم بوونەوەرەو ژیان و مرۆڤە تۆمار بكات، ئەمە هەم واقیعـەو هـەم شـەرعیش وا ئەڵێ: واقیعە لەبەر ئەوەی ئەم بوونـەوەرە لەسـەر سیـستمێكی ورد ئـەڕوات كـە نەخشەی بۆ دارێژراوەو بە موو لانادات لێی. و ئەبێ هەر واش بێت چونكە خۆ خوا وەك ئێمە ناوەستێت بەدیار ئەم بوونەوەرەوە بۆ ئەوەی بزانـێ تـا كـوێ ئـەڕوات و بەرەو كوێ مل ئەنێت! بەڵكو خوا نەخشەكەی بۆ داناوەو ئەبێ بەو نەخشەیە بڕوات و لەو حاڵەدا بوەستێت كە خوا دایناوە تێیدا بوەستێت، خوای گـەورە ئەفـەرموێ: (وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجًا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنْثَى وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ وَمَا يُعَمَّرُ مِنْ مُعَمَّرٍ وَلَا يُنْقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (١١)، هەروەها ئەفەرموێ:(مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٢٢) لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (٢٣) ، هەروەها ئەفەرموێ:( وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ)، چەند فەرموودەش هەیە ئەمە روونترئەكاتەوە.

ب: زیاد لەمەش ئەو تۆماركردنەی خوا كەی مرۆڤ ناچارئەكات ئیرادەو عەقڵ و ئیختیاری خۆی لەدەستبدات، ئـەوە درۆكردنـە بـەدەم خـواوە چـونكە خـۆ خـوا

ئاگاداریان ناکات لەو شتانە یـان بـەنیگا بۆیـان بنێرێـت و ئـەوانیش مووبـەمـوو لەگەڵیدا بڕۆن، ئەی ئیتر چۆن ئـەزانێ خـوا ئەمـەیانی نووسـیووە یـان ئـەوەیانی نووسیوە؟

ج: زیاد لەمـەش باشـە خـۆ خـوا نیگـاو پـەیامێکی وردو بەرژەوەنـدنامێزی بـە پێغەمبەراندا بۆ ناردوون و کەچی ئەوان مووبەموو لەگەڵی ناچن و ناشڵێن: خوایـە مادامێك تۆ ئەو شتانەت تۆمار کردووەو داواتکردووە لێمان کە بیکەین ئیتر زەوی و ئاسمانەکان و ئەوانەشی لەو ناوەندەدان هەموو ناچارین کە پێڕەو لەو نووسـراوەی تۆ بکەین و ئیتر ئیرادەو ئیختیارو عەقڵی خۆمان لەدەست بدەین!

د: زیاد لەمەش ئەو جۆرە کەسانە هەمیشە باس لە لایەنە سـلبیەکە ئەکـەن نـەك لایەنە ئیجابیەکە وەك بەرهەمێکی سروشتی ئەو ناخپیـیەیان کە تووشی هاتوون: ئەو جۆرە مرۆڤانە هەرگیز ناڵێن: خوایە مادامێك تۆ نووسـیووتە ئێمـە نوێژگـەرو موسڵمان و عیبادەتکەر بـین ئـەوە ناچـارین و ئـەوەتا خـەریکی ئـەوەین کـە تـۆ نووسیووتە! بەڵکو ئەو جۆرە کەسە لارانە هەمیشە لایەنە خراپەکە ئەگرن و ئەڵێن: مادامێك تۆ نووسیووتە گوناهبارو خراپ بین ئەوە بۆیە ئێمە ناچارین خراپ بـین و خەریکی گوناهکردن بین!

هـ: زیاد لەمانەش قسەکەی عومەر چەند جوانە کە ئەشیداتە پاڵ پێغەمبەر(صلی الله علیەو الە وسلم)کـە ئەفـەرموێ:"مثـل علـم الله فـیكم کمثـل السـماء الـتي أظلتكم، والأرض التي أقلتكم، فكما لا تسـتطيعون الخروج مـن السـماء والأرض فكذلك لا تستطيعون الخروج من علم الله تعالى، وكما لا تحملكـم السـماء والأرض على الذنوب فكذلك لا يحملكم علـم الله تعـالى عليهـا". نمونـەی زانسـتی-واتـە سیستەمەکانی خوا کە لەڕووی زانستی خواوە دانراون بۆ ژیـان-وەك ئـەم ئاسمانـە

وایە كە سەری لێگرتوون و وەك ئەم زەمینە وایە كە ژێـری لێگرتـوون، وەك چـۆن ناتوانن لەسنووری ئاسمانەكان و زەمین بچنە دەرەوە هەرواش ناتوانن لەسنوورەكانی زانستی خوا بچنە دەرەوە، بەهەمان شێوە وەك چۆن ئاسمانەكان و زەمـین ناچـارتان ناكەن گوناهێكی دیاریكراو بكەن، بەهەمان شێوە زانستی خواش ناچارتان ناكـات گوناهێكی دیاریكراو بكەن.

و: زیاد لەمانەی سەرەوەش ئێمە ئەوەشمان سەلماند بەبەڵگەی قورئانی و حەدیسی و بیروڕای صـەحابەو زانایـانی كـۆن و تـازە كـە قـەدەرەكان ئـەتوانرێن بگـۆڕرێن و بەوەسیلەی شەرعی و گونجاو دەستكاری بكرێن و ئەمەش یاسای خوایەو ئەوە"جل جلالـە" ئـەیانگۆڕێت بـۆ عەبـدەكانی و خـوا ئـەو دەرفەتانـە بـۆ بەنـدەكانی ئەڕەخسێنێت.

ز: لەسەروو ئەمانەشەوە ئێ خۆ بەپێی حەدیسی صەحیح خوا هەموو كەسێك بـە موسڵمانی و ئیمانداری دروستنەكات، بەلاَم دواتر باوك و دایك ئەیكەنە جوولەكـە یان گاور یان ئاگرپەرست وەك پێغەمبەر(صلی الله علیەو الەوسلم)ئەفـەرموێ: :( مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَـأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِـهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَـانِهِ كَمَـا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ رضي الله عنـه: (فِطْرَةَ اللهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللهِ، ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ)، هیچ منالێك نییە بە موسڵمانێتی لەدایك نەبێت، دواتـر ئـیتر لـە لایـەن بـاوك و دایكیەوە یان ئەكرێ بە جوولەكە یان بـە گـاوور یـان بـە ئاگرپەرسـت، وەك چـۆن ئاژەڵی لووت و گوێ ساغ بەگوێ و لووتی ساغەوە لەدایكی ئـەبێت ئایـا ئـەبینن لووت و گوێی بڕاوبێت كە لەدایك ئەبێت؟

جا کەواتە بۆچی ئەو کەسە لارو خوارانە ناڵێن: خوایە تۆ هەر بەموسڵمانی ئێمەو خولقاندووە لەبەر ئەوە ناچارین و هەر ئەبێ خواناس و خواپەرست بین و ناتوانین بێدین و گوناهبار بین!!

**گومانی سێیەم:** ئەگەر خوا شتێکی ویست و عەبدیش شتێکی ویست و شەیتان شتێکی ویست ئایا ویستی کامیان جێبەجێ ئەبێت؟ یان ئەگەر خوا شتێکی نەویست و مرۆڤ یان شەیتان ئەو شتەیان ویست ئایا کامیان جێبەجێ ئەبێت؟

ئێمە لەپێشەوەش وتمان: کە خوا ئەتوانێ کاری هەریەك لەمرۆڤ و پەری و شەیتانەکان رابگرێت و نەیەڵێت ئەو کارانە بین، یان رێگەبدات پێچەوانەکانیان بین، بەلام عەبد ناتوانێ کارێك کە خوا ئەیەوێت رایبگرێت یان پێچەوانەکەی ببێت، چونکە راگرتنی کاری عەبد لە لایەن خواوە لاوازی عەبد ئەگەیەنێت و خواش لاواز نیە تاعەبد کارەکانی رابگرێت و پەکیانبخات!خوای گەورە ئەفەرموێت:"وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ"،خوا بڕیارئەدات و حوکم ئەکات کەس ناتوانێ پەرچ لەبەردەم حوکمی خوادا دابنێ، بەلام ئەگەر شتێك روویدات کە خوا خۆشی نایەت لێی ئەوە خوا ئیزنیداوە روویدات لەبەر هۆیەك یان زیاتر، نەك بێئاگاداری و بێئیزنی ئەو رووياندابێت..

**گومانی چوارەم:** ئایا کە عەبد کوفرئەکات یان گوناه و داوێنپیسی ئەکات ئەوە خوا ئەیەوێت و پێیخۆشە وەك چۆن چاکەی ئەوێت و پێی خۆشە؟ یان ئەوە سەرکەوتنە بەسەر ئیرادەو ویستی خواداو بەزاندنی ئەوە-پەنا بەخوا- ئەو نایەوێت و کەچی هەر رووشئەدات؟!

لەوەلامدا ئەڵێین: نەنەمیانەو نەئەویانە، هەروەها جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو شتانەدا کەخوا ئیزن ئەدات روویدەن: هەیە رووئەدات و خواش پێیخۆشە، هەیە

روونەدات و خوا پێیخۆش نییە، کاتێك کە ئیزن ئەدات کاری چاك بکرێت ئەوە پێیخۆشەو ئەشیەوێت بکرێت، کە ئیزنیش ئەدات کاری خراپە بکرێت پێیخۆش نییە بەلاّم ئیزن ئەدات بکرێت، ئەگەر ئەشیەوێت بکرێت ئەوە ئیزن نادات و حەتمەن نابێ بکرێت و روویدات، چونکە کێ ئەتوانێ رێگە لەخوا بگرێت.(وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ)، خوا ئەگەر ویستی سزای قەومێك بدات ئەوە کەس ناتوانێ رەتیبکاتەوەو جگە لەخواش کەس ناتوانێ ببێتە پشتیوانیان، خواش ویستی وابوو کەمیللەتێك تووشی سزایەك بکات ئەوە کەس ناتوانێ رەتیبکاتەوەو ئەو میللەتەش جگە لەخوا پشتیوانێکیان بۆ نییە، بۆیە خوا ئەکوفرو خراپەکاری ئەوێت و ئەپێیخۆشە بکرێن، بەلاّم لەبەر ئەوەی بریاریداوە مرۆڤ و پەری بکاتە خولقاوێکی خاوەن ئیرادە، رێگەی ئەو شتانەیان لێناگرێ مەگەر بۆ حیکمەتێك بێت، خوای گەورە ئەفەرموێ:(إِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكُمْ وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى)، ئەگەر کافربن خوا بێمنەتە لێتان و رازی نییەو کوفری پێخۆش نییە بۆ عەبدەکانی، ئەگەر سوپاسیشی بکەن پێی رازییەو خۆشی دێ لێتان، گوناهی کەسیش نادرێت بەکۆلّی کەسی تردا..

**گومانی پێنجەم:** ئایا خوای گەورە لەو پێشبینیانەدا کە ئەیکات بۆ ئاسمانەکان و ئەستێرەکان و مرۆڤ و شەیتان و پەریەکان ئەکەوێتە هەلّەو رێئەکەوێت کە وادەرنەچێت و پێچەوانەکەی دەربچێت؟

لەوەلاّمدا ئەبێ بلّێین: ئەگەر بەهەلّە دەربچێت ئەوە بەلگەی سنوورداربوونی زانستی خوایەو بەلگەشە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە ئاگای لە جیهانی غەیب و نادیار نیەو خواش هەر ئەوەندەی مرۆڤ بینینی ئەروات و ئەمەش بە شەرع و بە

عەقلیش هەڵەیە، خوای گەورە ئەفەرموێ:" وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ (٥٩). ئەمە بەعەقلیش هەڵەیە، چونکە ئەوە ئەوپەڕی نوقسانیە ئەگەر رووبدات و نابێ خواش نوقسانی تێدابێت.

**گومانی شەشەم:** ئێوە کە ئەڵێن: قەدەرەکان ئەگۆڕرێن و تەمەن کەم و زیادی پێئەکرێت و رزق زۆرو کەمی پێئەکرێت، ئەی وەڵامی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليەوالە وسلم)چۆن ئەدەنەوە کە کاتێك ئوم حەبیبە دوعای کردوو ووتی:"اللهم أمتعني بزوجي رسول الله صلى الله عليه وسلم و بأبي أبي سفيان و بأخي معاوية "، پێغەمبەریش(صلى الله عليەوالەوسلم) فەرمووی: " قَدْ سَأَلْتِ اللَّهَ لآجَالٍ مَضْرُوبَةٍ وَأَيَّامٍ مَعْدُودَةٍ وَأَرْزَاقٍ مَقْسُومَةٍ لَنْ يُعَجِّلَ شَيْئًا قَبْلَ حِلِّهِ أَوْ يُؤَخِّرَ شَيْئًا عَنْ حِلِّهِ وَلَوْ كُنْتِ سَأَلْتِ اللَّهَ أَنْ يُعِيذَكِ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ أَوْ عَذَابٍ فِي الْقَبْرِ كَانَ خَيْرًا وَأَفْضَلَ "رواه مسلم، ئەوەتا پێغەمبەر(صلى الله عليەو الە وسلم) رەخنە لە ئوم حەبیبە ئەگرێ کە داوای تەمەندرێژی بۆ مێردو براو باوکی ئەکات و پێی ئەفەرموێ: تۆ داوای گۆڕینی ئەجەلێك ئەکەی کە دانراوەو داوای گۆڕینی شوێنەوارێك ئەکەی کەنەخشەکەی رێژراوەو داوای گۆڕینی رزقێك ئەکەی کە دابەشکراوە!

زانایان بۆ وەڵامی ئەمە ئەڵێن:

١-لەچەندین فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا هاتووە کە تەمەن و رزق گۆڕانیان بەسەردادێت کەئێمە لەپێشەوە چەند فەرموودەمان هێنا، هەروەها لەئەنەسەوە بە صەحیحی هاتووە کەپێغەمبەر(صلى الله عليەوالە وسلم) پێیفەرمووە:"اللهم أكثر

ماله وولده وأطل حياته واغفر لـه"[١]، خوایه ماڵیشی زۆربكەو منداڵیشی زۆربكـەو تەمەنیشی درێژ بكەو لێشی خۆشببە، ئەنەس خۆی ئەفەرموێ:" فدعا لـي بـثلاث فدفنت مائة وثلاثة وان ثمرتي لتطعم في السنة مرتين وطالت حياتي حتى استحييت من الناس وأرجو المغفرة "[٢]. پێغەمبەر(صلى الله عليه و آلـه وسلم)سـێ دوعـای بۆكردم، ئەوەبوو بەدەستی خۆم صەدو سێ نەوەی خـۆمم ئەسـپەردەی خـاك كـرد، دارودرەختەكانم ساڵی دووجار بەریانئەداو لێیان ئەخورا، ئەوەنـدەش تەمـەنم درێـژ بوو شەرمم لە خەڵكی ئەكردو ئومێدیشم وایە خوا لێمخۆش ببێت.

هەروەها سـەعدی كوڕی ئـەبی وەققـاص(رەزای خـوای لێبێـت) دوعـای كـرد لـە كابرایەك كە بوختانی بۆكردبوو، وتبووی:"إن سعداً كان لا يسير بالسرية، ولا يقسم بالسوية، ولا يعدل في القضية"، سەعد ناچێت بـۆ جیهـاد لەگـەڵ مەفرەزەكانـدا، بەداد سامان دابەش ناكات و دادپەروەریش نیە لە داوەریكردندا! سەعدیش دوعای لێكردو فەرمووی:"أما والله لأدعون بثلاث: اللهم إن كـان عبـدك هـذا كاذبـاً قـام رياءً وسمعة، فأطل عمره، وأطل فقره، وعرّضه للفتن"، سوێند بـەخوا منـیش سـێ دوعات لێئەكەم: پەروەردگار ئەگەر ئەم عەبدەی تۆ درۆئـەكات و ئـەم قسـەیە بـۆ ریابازی و ناوبانگ ئەكات، ئەوە تەمەنی درێژبكەرەوەو هەژاری بخەو بیكەرە پەندو ئابڕووی ببە، ئەوەبوو كابرا كۆڵەواربوو بە دوعاكەی سەعدەوەو لەوەودوا كە كـاری گەنی ئەكرد لێیان ئەپرسی ئەوە شـەرم ناكـەی؟ ئـەیووت: پیرێكـی ئـاخر شـەڕم، كۆڵەواربووم بە نزاكەی سەعدەوە! ئەوەی ئەم رووداوە ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: مـن خـۆم

---

[١] الادب المفرد، قال الشيخ الألباني: صحيح.

[٢] الأدب المفـرد، محمـد بـن إسماعيـل أبـو عبـدالله البخـاري الجعفـي، ت:محمـد فـؤاد عبـدالباقي، http://www.almeshkat.net

ئەو پیاوەم بینی ئەوەندە پیربوو پێڵوی هەردووچاوی نیشتنەسەر یەکتری و شەرمی تێدا نەمابوو، بەو کوێری و تەمەنەوە رێگەی بە کەنیزەك و کچان ئەگرت و دەستبازی لەگەڵ ئەکردن![1].

٢-لەپێشەوە باسی ئەوەمانکرد کە مرۆڤ دروستە بۆی کە داوابکات خوا زووتر بیمرێنێت ئەگەر ژیان خێر نیە بۆی و قیامەت خێرترە بۆی، وەك ئەفەرموێت: (لايَتَمَنَّيَنَّ أحَدُكُمُ الْمَوْتَ مِنْ ضُرٍّ أصَابَهُ فَإنْ كَانَ لابُدَّ فَاعِلا فَلْيَقُلِ : اللَّهُمَّ أحْيِنِي مَاكَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي).[2]

جا لەراستیدا ئەگەر ئەو دوعاکردنە گاڵتەجاڕی بێت و داواکردنی شتی محاڵ بێت ئەوە نە پێغەمبەر(صلى الله عليه‌واله‌وسلم)موسڵمانان فێری ئەو دوعایە ئەکات و نەئەو دوعایەش دروستە مرۆڤی موسڵمان بیکات.

٣- هەندێ لەزانایان ئەڵێن: ئەم فەرموودەیەی نوم حەبیبە دژایەتی ئەو راستیانە ناکات و ئەوەی لەو فەرموودەیە وەردەگیرێت ئەوەیە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه‌واله‌وسلم) رێگری لەو دوعاو پاڕانەوەیە نەکردووەو نەیفەرمووە: ( نزاکردن بۆ زیادکردنی تەمەن هیچ رۆڵێك و کاریگەرییەکی نییە)یان نەیفەرموو: (عائیشە دوعای وامەکە دروست نیە)، تا ئێوەش بیدەن بەگۆی ئەو حەدیسانەی تردا کە لەخاڵی یەکەمدا باسمانکردن، بەڵکو نوم حەبیبەی فێری باشترین شێوازکردووە لەنزاکردندا چونکە نزاکردن عیبادەتەو رەچاوکردنی باشترین شێوازیش شتێکی پێویستە تێیدا"[3]، لەمەش رۆشنتر ئیبنومفلیح ئەفەرموێ:( أن هذا الحديث أنه

---

[1] بڕوانە: "الجمع بين الصحيحين البخاري ومسلم"، محمد بن فتوح الحميدي،تند. علي حسين البواب.

[2] الاداب ،البيهقي،باب: المصيبة بالاولاد.

[3] تعليقات على شرح العقيدة الطحاوية لابن أبي العز الحنفي، عبد العزيز بن محمد العبد اللطيف، www.saaid.net/book/index.php

-عليه الصلاة والسلام- لم ينه أم حبيبة أو لم يخطئ أم حبيبة في دعائها وإنما أرشدها إلى الأفضل، الأفضل أن تستعيذ من عذاب جهنم ومن عذاب القبر)[١].

وەك لەفەرموودەیەكی تردا هاتووە پێغەمبەر(صلى الله علیەوالەوسلم) هەموو موسڵمانان فێرنەكات كە بەشێوازێكی جوان دوعابكەن و ئەفەرموێت:( يا أيها الناس إن الغنى ليس عن كثرة العرض ولكن الغنى غنى النفس وإن الله عز وجل يؤتي عبده ما كتب له من الرزق فأجملوا في الطلب خذوا ما حل ودعوا ما حرم).[٢] ، خەڵكینە! دەوڵەمەندی بەماڵ زۆری نیە، بەڵكو دەوڵەمەندی دەروونە، خوای پەروەردگاریش ئەو رۆزی و بژێوییەی بۆ عەبدی بڕیوەتەوە هەر پێینەدات، جا ئێوەش بەجوانی دوعاو داوا بكەن، ئەوەی حەلاڵە وەریبگرن و ئەوەشی حەرامە وازیلێبهێنن..

٤-هەندێ لەزانایان ئەڵێن: یەكێك لەناوەكانی خوای گەورە(المؤخر)ە، یانی: شت دێنێتە دواوە، وەك چۆن شتیش ئەباتە پێشەوە، دواخستنی شت یان (كەونیە)وەك دەستكاریكردن و دواخستن یان پێشخستنی تەمەن و ژیان و مردن، یان شەرعیە وەك دواخستن و پێشخستنی نوێژو رۆژووشكاندن و ..هتد، بۆیە سروشتیە كە ئەو دوعایەش بكرێت و هیچ دژایەتیەكی شەرعی تێدا نیە[٣].

---

[١] وەرگیراوە لە(مادەی عەقیدە بۆ ئاستی چوارەم: ل٨٤)، لەنووسینی هەمان نووسەری سەرچاوەی پێشوو، ئەویش لە كتێبی "الفروع"ی ئیبن مفلح وەریگرتووە كە بەدەق ئەڵێ: (فَلَمْ يَنْهَ وَلَمْ يَقُلْ إنَّ الدُّعَاءَ لَا أَثَرَ لَهُ فِي زِيَادَةِ الْعُمْرِ، وَإِنَّمَا أَرْشَدَ إلَى الْأَفْضَلِ لِأَنَّهُ عِبَادَةٌ ).

[٢] صحيح لغيره، (صحيح الترغيب والترهيب – الألباني، ژمارەی فەرموودە: ١٧٠١).

[٣] بڕوانە كتێبی:( أسْمَاءُ اللهِ الحُسْنَى الثابتة في الكتاب والسنة، د.محمود عبد الرازق الرضواني، الأستاذ المساعد بقسم العقيدة والمذاهب المعاصرة،كلية الشريعة وأصول الدين جامعة الملك خالد).

## كۆتایی

چەند سەرنجێك لەسەر فەرموودەكەی ئیبن مەسعود

لەكۆتایی ئەم نامیلكەیەدا پێمباشە كەچەند تیشكێك بخەینەسەر ئەو فەرموودەیەی عەبدولای كوڕی مەسعود كەباسی قەزاو قەدەر ئەكات و هەندێك لەبەر زۆر وردنەبوونەوە لێی ئەیكەنە كێشە لەم بابەتەدا، ئەمەش بۆ ئەوەی ببێتە بەشێك لەچارەسەر نەك بەشێك لەگرفتەكە.

عەبدولای كوڕی مەسعود ئەڵێ پێغەمبەر(صلى الله علیه والەوسلم) پێیڕاگەیاندین كە بڕوامان وایە هەر ئەوە راستگۆو بەڕاستگۆ زانراوو فەرمووی:« إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَربَعِينَ يَوماً نُطْفَةً ، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذلِكَ ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذلِكَ ، ثُمَّ يُرْسَلُ المَلَكُ ، فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ ، وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ : بِكَتْبِ رِزْقِهِ وَأجَلِهِ وَعَمَلِهِ وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ . فَوالَّذِي لا إلهَ غَيْرُهُ إنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وبَيْنَهَا إلا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيهِ الكِتَابُ ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيدْخُلُهَا ، وَإنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إلا ذراعٌ ، فَيَسْبِقُ عَلَيهِ الكِتَابُ فَيعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا » . مُتَّفَقٌ عَلَيهِ .

واتە: دڵنیابن كە هەریەك لە ئێوە لەسكی دایكیدا چل رۆژ بە نوتفەیی ئەمێنێتەوەو پاشان ئەوەندەش بە عەلەقەیی و پاشان ئەوەندەش بە موزغەیی، پاشان فریشتەیەكی بۆ ئەنێررێت و رۆح ئەكات بەبەریداو فەرمان بەو فریشتەیە ئەكرێت كە چوار وشە هەیە بینووسێت: نووسینی رزق و ئەجەل و كارو كامەرانی یان بەدبەختی ئەو كەسە، بەو كەسەی جگە لەو خوایەكی راستەقینەی تر نییە هی واتان هەیە خەریك ئەبێت بەكاری خەڵكی بەهەشتەوە تا ئەندازەی قۆڵێك لەنێوان

ئەوو بەهەشتدا ئەمێنی کتێب پێشی ئەکەوێت و دەست ئەداتە کاری خەڵکی ئاگرو ئەچێتەناوی، هی واشتان هەیە خەریك ئەبێت بەکاری خەڵکی ئاگرەوە تا ئەندازەی قۆڵێك لەنێوان ئەوو ئاگردا ئەمێنی کتێب پێشی ئەکەوێت و دەست ئەداتـە کـاری خەڵکی بەهەشت و ئەچێتەناوی..

ئەم فەرموودەیەی ئیبن مەسعود سەبارەت بە قـەزاو قـەدەر گـرفتی زۆر دروستئەکات بۆ ئەو کەسانەی کە شت وردناکەنەوەو هەروا لەناو زاهیرو رووکەشـی مەسەلەکاندا ئەمێننەوەو ناچنە ناو کـرۆك و قـولایی بابەتـەکان و تـەنیا لەتاکـە فەرموودەیەکەوە حوکمی مەسـەلەیەکی ئاڵۆزی وا وەرئەگرن نەك لەکۆی هەموو ئەو فەرموودانەوە کە لەم بابەتەدا هاتوون.

**یەکەم:** ئەم فەرموودەیە راستەو بوخاری موسلیم ریوایەتیانکردووەو بـەو پێیـەش نابێ صیحەتی فەرموودەکە بخرێتە ژێر پرسـیارەوە، بۆیـە ئـەڵێین: فەرموودەکـە صەحیحەو نکولی لێناکرێت، بەڵام نـابێ حـوکمی مەسـەلەیەکی هەسـتیاری وەك قەزاو قەدەر بەتەنیا لەم فەرموودەیەوە وەربگرین و هەموو فەرموودەکانی تـر کـە لەم مەسەلەیەدا هاتوون پشتگوێ بخەین یـان لەبـەر ئـەمیان هـەموو ئـەوانی تـر تەئویل یان تەزعیف بکەین، بەڵکو ئەبێ ئەوە بـزانین هـیچ رێگرێـك نیـە لـەوەدا ئەمیان تەئویل بکەین و لەگەڵ ئەوانی تردا بیگونجێنین وەك لە پێشـەوە ئەمـەمان روونکردەوە لەرووی بەڵگەوە.

**دووەم:** لە حەدیسـەکەدا سەرەتا چوار شت باس ئەکات:( نووسینی رزق و ئەجەل و کارو کامەرانی یان بەدبەختی ئەو کەسە) بەڵام لە دواییـدا تـەنیا باسـی دوانیـان ئەکات کە قابیلی گۆڕین نین: (بەدبەختی یـان کامـەرانی، هـەروەها کارەکـانی)، کەچـی باسـی (رزق و ئەجەلەکـە)ی نـەکردووەو ئەمـەش پشـتیوانێکە بـۆ ئـەو

فەرموودانەی تر کەئەفەرموێت: " لاَ يَرُدّ القَضَاءَ إلاّ الدّعَاءُ، وَلاَ يَزِيدُ في العُمُرِ إلاّ البِرّ"[١] ،"الدعاء يرد القضاء، وإن البر يزيد في الرزق، وإن العبد ليحرم الرزق بالذنب يصيبه"[٢]،" لا ينفع الحذر من القدر ، ولكن الله عز وجل يمحو بالدعاء ما شاء من القدر»[٣]، "مَنْ سَرّهُ أنْ يُبْسَطَ لَهُ رِزْقُهُ، أو يُنْسَأَ لَهُ فِي أثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ».[٤] ، ئیمامی سیوتی لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا کۆمەڵێك قسەی جوان ئەکات و ئەفەرموێ:"من سره أن يبسط عليه في رزقه"یانی: رزقی فراوان بکرێت و بۆی زیادبکرێت، ئەشڵێن: یانی: بەرەکەتی تێئەخات، "ينسأ في اثره" واتە: ئەجەلی دوابخرێت، چونکە ئەجەل سەربەژیانە، ئەوەی لەحەدیسەکەوە دەرئەکەوێت ئەوەیە کە ئەجەل زیادیش ئەکات و کەمیش ئەکات، ئەمەش دوو ڕای مەشهوری لەسەرە..(بەلاّم) ئەوانەی ئەڵێن: ئەجەل ناگۆڕێ دێن تەئویلی ئەم حەدیسە ئەکەن و ئەڵێن زیادبوون یانی بەرەکەت ئەکەوێتە کاتەکانی و پشتیوانی ئەکرێت بۆ عیبادەتی زۆرتر، منیش کتێبێکی تایبەتم لەو بارەیەوە داناوە[٥] .

**سێیەم:** ئێمە لە پێشەوە ئەوەمان سەلماند کە -بۆ نمونە-یەکێکی وەك عومەری کوڕی خەتتاب و عەبدوڵای کوڕی مەسعودو ئیبن عەبباس لەناو صەحابەکانداو زەحاك و قەتادە لەناو تابیعینداو شەوکانی و ئالووسی و کێ و کێ لەناو

---

[١] ژمارە:"٩٩٦٨" لە کتێبی" الجامع الصغير في أحاديث البشير النذير، جلال الدين عبد الرحمن بن أبي بكر السيوطي.

[٢] ژمارە:"٢٤٥٧" لە کتێبی" الجامع الصغير في أحاديث البشير النذير، جلال الدين عبد الرحمن بن أبي بكر السيوطي.

٣ القضاء والقدر للبيهقي،ص١٨٧.

[٤] اللؤلؤ والمرجان فيما اتفق عليه الشيخان، محمد فؤاد عبد الباقي.

[٥] الديباج على صحيح مسلم، جلال الدين/السيوطي

موفەسیرو زانایاندا بیرو ڕایان وایە کە کامەرانی و بەدبەختییش هەر قابیلی گۆڕانن و قسەکەشیان دروست و شەرعیەو پڕە لەڕووناکی و بەرژەوەندی و مەنتیق.

**چوارەم:** مانای دروستی ئەو فەرموودیەش ئەوەیە: ئەو شتانەی بۆ ئەنووسرێت و ئیتر ئەخرێتەناو هۆڵی تاقیکردنەوەو سەیرئەکرێت هەوڵی گۆڕینی ئەو قەدەرانە ئەدات تابۆی بگۆڕرێت یان پاڵی لێئەداتەوەو هیچ ناکات و ئەو رزق و ئەجەل و کارو کردەوانەی وەك خۆی ئەهێڵێتەوە، جا ئەگەر خۆی فریوداو خەڵکیشی بەخۆیەوە بەدبەخت کردو وەك کابرای ئاگرپەرستی کرد کە ووتی: ئاخر خوا نایەوێت من موسڵمان ببم و کاری خێر بکەم! یان وەك پیرەژنەکەی لای مەولەوی ئەکات و ئەڵێ: خوا لەئەزەلا بۆمنی نووسیوە کە نوێژنەکەرىم!، ئەوە ئەبێ لۆمەی خۆی بکات و ئەگەر کەوتە تێکۆشان و هەوڵی جیددیش بۆ گۆڕینی قەدەرەکان و سەرکەوتوو بوو، ئەوە سوپاسی خوا بکات کە هاوکاری کردووەو ئیزنی داوە بە ئەندامەکانی لەشی خۆی و بەدروستکراوەکانی چواردەوریشی کە هاوکاری بکەن و نەبنەڕێگر لەبەردەمیدا،خوای گەورە لەفەرموودەیەکی قودسیدا کەپێغەمبەر (صلی الله علیەوالەوسلم) ئەیگێڕێتەوە دەربارەی رۆژی قیامەت، ئەفەرمووێت:

( يَنْزِلُ الْجَبَّارُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ وَالْمَلاَئِكَةُ، يَحْمِلُ عَرْشَهُ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ.. فَيَضَعُ اللَّهُ كُرْسِيَّهُ حَيْثُ شَاءَ اللَّهُ مِنْ أَرْضِهِ، ثُمَّ يَهْتِفُ بِصَوْتِهِ، فَيَقُولُ: يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنْسِ، إِنِّي قَدْ أَنْصَتُّ لَكُمْ مِنْ يَوْمِ خَلَقْتُكُمْ إِلَى يَوْمِكُمْ هَذَا أَسْمَعُ قَوْلَكُمْ وَأُبْصِرُ أَعْمَالَكُمْ فَأَنْصِتُوا لِي، فَإِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ وَصُحُفُكُمْ تُقْرَأُ عَلَيْكُمْ، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ، ثُمَّ يَأْمُرُ اللَّهُ جَهَنَّمَ فَيَخْرُجُ مِنْهَا عُنُقٌ سَاطِعٌ مُظْلِمٌ، ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ، عَزَّ وَجَلَّ:{أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ وَأَنِ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ

مُسْتَقِيمٌ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلا كَثِيرًا أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ هَذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ} [١] ، یانی: خوای گەورە لەناو هەورێکی پاکەوەو هاورێ لەگەڵ فریشتەکاندا دائەبەزێت کە هەشت فریشتە عەرشی خوایان هەڵگرتووە، خوای گەورەش لەکوێی زەویەکەیدا ویستی کورسیەکەی دائەنێت و بەدەنگی خۆی ئەفەرموێ: ئەی بەرەی پەری و مرۆڤ! من لەو رۆژەوەی کە ئێوەم دروستکردووە قسەکانی ئێوە ئەبیستم و سەیری کارەکانی ئێوە ئەکەم، کەواتە ئێوەش ئەمڕۆ بێدەنگ بن و گوێم بۆ بگرن: دڵنیابن! ئەمانە هەموو کاری خۆتانن و نامەی کردەوەکانی خۆتانن بۆتانئەخوێنرێتەوە، جا هەرکەس کاری باشی تێدا بینی ئەوە باسوپاسی خوا بکات، و هەرکەسیش جگە لەوەی بینی با لۆمەی کەس نەکات لۆمەی خۆی نەبێت. لە ریوایەتێکی تردا ئەفەرموێ: (یاعِبادي ! إنَّما هِيَ أعْمالُكُمْ أحْفَظُها عَلَيْكُمْ، فَمَنْ وَجَدَ خَيْراً فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ عَزَّوَجَلَّ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلا يَلُومَنَّ إلاَّ نَفْسَهُ). [٢]

یانی: ئەی بەندەکانم! دڵنیابن کە ئەوەی لەکارنامەکانتاندا ئەیبینن کردەوەکانی خۆتانن و بۆم پاراستوون، جاهەرکەس کاری باشی تێدا بینی ئەوە باسوپاسی خوا بکات، و هەرکەسیش جگە لەوەی بینی با لۆمەی کەس نەکات لۆمەی خۆی نەبێت.

**پێنجەم:** ئەو فەرموودەیە دوو ئیعجازی زانستی زۆر گەورەی تێدایە، یەکەمیان دەرباری دروستبوونی مرۆڤە لەسکی دایکانداو دووەمیان دەربارەی ژیانی مرۆڤە پاش دەرچوونی لەسکی دایکی، یەکەمیان شتێکی مادیی و فیزیکییە: باسی

[١] إتحاف الخيرة المهرة بزوائد المسانيد العشرة، أحمد بن أبي بكر بن إسماعيل البوصيري.

[٢] الاذكار النووية، محيي الدين أبي زكريا يحيى بن شرف النووي الدمشقي.

قۆناغەکانی دروستبوونی کۆرپەلەیە کە حەتمەن ئەبێ بەو شێوەیە دەربچێت کەخوا ئەیەوێت و بەرنامەی بۆ داناوەو زانستی تازەش ئەمەی سەلماندووە، دووەمیان شتێکی مەعنەوی و غەیبییە: سنوور بۆ رزق و ژیان و کارو کامەرانی یان بەدبەختی ئەکێشرێت کەحەتمەن هەر ئەبێ لەو سنوورەدا بەرزو نزم بکات، ئەمە نمونەی لەناو مرۆڤەکانیشدا هەیە، بۆ نمونە: دەوڵەت بە هاوڵاتیانی ئەڵێت: ئەوە سنووری بژێوی و مووچەی ئێوەیە، ئەگەر ئەو کارانە بکەن بژێویەکەتان بەرزئەبێتەوە بۆ ئەو سنوورەو ئەگەر ئەو کارانەی تر بکەن بژێویتان نزمئەبێتەوە بۆ ئەو سنوورە، پاش ئەوە باڵانسیان بۆ دائەنرێت و پەیوەست ئەکرێن بەبەرنامەیەکەوە کە پێڕەوی لەو سیستەمە بکات، واتە: (ئەگەر ئەو کارانە بکەن بژێویەکەیان بەرزئەبێتەوە بۆ ئەو سنوورەو باڵانسەکەیان زیادئەکرێت، ئەگەر ئەو کارانەی تر بکەن بژێوییان نزمئەبێتەوەو دێتەخوار بۆ ئەو سنوورە). ئەم فەرموودەیەش شتێکی لەو شێوەیە، ئەو سنوورانە دیاریئەکرێن و داخڵ بەو سیستەمە ئەبن کە هەموو کارەکان رێژەی دیاریکراوی خۆیان ئەبێت و قابلییەتی ئەوەشیان پێئەدرێت کەزیادو کەم بکەن بە پێی هەوڵ و کۆششی کەسەکە. نەکەس ئەتوانێ لەو بەرنامانە دەبچێت، نەکەسیش بۆی هەیە لۆمەی جگە لەخۆی بکات ئەگەر وەك کەسانی تر ئەو قەدەرانەی نەگۆڕی بەرەو باش و باشتر، فەرموودەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليەوالەوسلم) ئەم روونکردنەوەیە روونترو رۆشنتر ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: "مثل علم الله فيكم كمثل السماء التي أظلتكم، والأرض التي أقلتكم، فكما لا تستطيعون الخروج من السماء والأرض فكذلك لا تستطيعون الخروج من علم الله تعالى، وكما لا تحملكم السماء والأرض على الذنوب فكذلك لا يحملكم علم الله تعالى عليها"، نمونەی زانستی-واتە سیستەمەکانی خوا کە

لەڕووی زانستی خواوە دانراون بۆ ژیان-وەك ئەم ئاسمانە وایە كە سەری لێگرتوون و وەك ئەم زەمینە وایە كە ژێری لێگرتوون، وەك چۆن ناتوانن لە سنووری ئاسمانەكان و زەمین بچنە دەرەوە هەرواش ناتوانن لە سنوورەكانی زانستی خوا بچنە دەرەوە، بەهەمان شێوە وەك چۆن ئاسمانەكان و زەمین ناچارتان ناكەن گوناهێكی دیاریكراو بكەن، بەهەمان شێوە زانستی خواش ناچارتان ناكات گوناهێكی دیاریكراو بكەن[1] .

ئەمەیە كە خوای گەورە لە دەیان ئایەتدا لۆمەی خەڵكی بەدبەخت ئەكات كە خۆیان بەدبەخت ئەكەن و لەبری ئەوەی عەقڵیان بجوڵێنن و قۆڵی كارو هەوڵی لێهەڵبماڵن و لەو بەدبەختیە خۆیان رزگار بكەن و بەرزی و بەرێزی خۆیان بسەلمێنن دێن خۆیان فریووئەدەن و ئەو بەدبەختی و دواكەوتنەیان ئەخەنە سەر خوای پەروەردگار و ئەڵێن: " لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِنْ شَيْءٍ كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ حَتَّى ذَاقُوا بَأْسَنَا".ئەگەر خوا بیویستایە ئەوە ئێمە هاوبەشمان بۆ ئەو دانەئەناو بەرنامەی حەرامكردنی هیچ شتێكیشمان

[1] بۆ نزیكردنەوەی ئەم چەمكە لە زیهن ڕوونترین نمونە بۆ مرۆڤ و قەدەرەكان بریتییە لە بەرنامەكانی "پلەی ستەیشن"، بەتایبەتی یاریە پلە بەرزەكان، كە ئەوانەی یاریەكە دەكەن ئازادن تەنانەت لە هەڵبژاردنی یاریزان و تەشكیلە پێكهێنان ...تا تەواوی یاریەكە لە سەرەتاوە بۆ كۆتایی، كەسیش نایەت بەخەیاڵیدا لەحاڵەتی دۆڕاندا لۆمەی دانەری بەرنامەكان بكات، ئەو وەك ئەو كەسە وایە كەفەیلەسوفەكان ئەڵێن:" مرۆڤ ئازادە لە دونیایەكی پڕسنووردا"، یان وەك ئەوەی هەندێ لەزانایان ئەڵێن:(مرۆڤ خولقاوێكی ئازادی ناچارە) یان (مرۆڤ شتێكە لە نێوان ئەمیش و ئەویشدا)، جا ئەگەر مرۆڤێك بتوانێت بەرنامەیەكی لەو شێوەیە دابنێت ئازادیەكانی یاریزانەكان بپارێزێت لەناو بەرنامەیەكی ئاوەها ووردا، ئیتر بۆ پەروەردگار ئەتوانێت مرۆڤ داخڵ بەبەرنامەیەك بكات ئازادی بكات لەوەدا تەشكیلەی خۆی هەڵبژێرێت و بەئازادی گەمەی ژیان بكات و كە بردیەوە خۆی بەبراوە بزانێت و كە دۆڕاش خۆی بەدۆڕاو بزانێت نەك یەكێكی ترو لۆمەی خۆشی بكات نەك بەرنامەكان و كۆمپیوتەرەكەو ئەم و ئەو.

نەئەبوو، ئابەو شێوەش خەڵکانی پێش ئەوان دەستیاندایە درۆکردن تا سزای سەختی ئێمەیان چەشت!

مەولەوی لەگەڵ پیرەژنێکدا کە تا ئەو تەمەنەش نوێژی نەئەکرد کەوتە گفتوگۆیەکی خوشك و برایانە، مەولەوی پێی ئەڵێت: ئەرێ دایەگیان تۆ بۆچی نوێژناکەی دوای ئەو هەمووە تەمەنە؟! پیرەژنەکە ئەڵێ: مامۆستا گیان!خوا لەئەزەلا بۆمنی نووسیوە کە نوێژنەکەرم! بۆیە من ئەگەر نوێژبکەم ئەوە عیلمی خوا ئەکەوێتەوە بەدرۆوە! مەولەویش فەرمووی:

دەفتـــــــەری عیلم و لەوحت لەبەربوو؟!

غەمت هەر جەهلی صاحێب دەفتەر بوو؟!

گروفتـــــــاری نەفس ئەمارەی خۆتی

شەل و پەت نەکـــــەی ئەی شێتی پەتی!

**شەشەم**: ئەم فەرموودەیەو ئەو فەرموودانەی تریش کە باس لەوە ئەکەن کە خوا ئاگادارە لەسەرەتاو لەکۆتایی هەموو شتێك و ئەزانێ کێ کامەرانەو کێ بەدبەختەو کێ بەهەشتیەو کێ جەهەننەمییە، وەك لەم فەرموودەی ئیبن مەسعوودەدا دەرئەکەوێت و لەدەیان فەرموودەی تردا ئەمە دووپاتکراوەتەوە، ئەوە مانایەکی ناسکی تێدایەو نزیکە لەم خاڵی پێنجەمەی کە وتمان..

ئیمامی بوخاری لە حەزرەتی عەلییەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(قَالَ كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ فَأَتَانَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ فَنَكَّسَ فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِهِ ثُمَّ قَالَ: « مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ مَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلاَّ وَقَدْ كَتَبَ اللَّهُ مَكَانَهَا مِنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ وَإِلاَّ وَقَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً ». قَالَ فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّه أَفَلاَ نَمْكُثُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ، فَقَالَ «

مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ »، فَقَالَ « اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ، أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وَأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ »، ثُمَّ قَرَأَ ( فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى)[1] ،واتە: لەگۆڕستانی بەقیعی غەرقەددا بووین و جەنازەیەکمان پێبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه‌واله‌وسلم) هات بۆ لامان وئەو دانیشت و ئێمەش دانیشتین بەدەوری ئەودا، پێغەمبەر(صلى الله عليه‌واله‌وسلم)عەصا بچکۆلانەیەکی بەدەستەوە بوو، سەریدانەواندو عەصا بچوکەکەی ئەخشاند بەزەویەکەداو پاش ماوەیەك فەرمووی:کەسێ نیە لە ئێوە، ڕۆحێك نیە لە ڕۆحە دروستکراوەکان شوێنی خۆی لەبەهەشتدا یان لەجەهەننەمدا نەنووسرابێ بۆی، یان نەنووسرابێت کامەرانە یان بەدبەختە! پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! جا کەوایە بۆچی دانەنیشین بەدیار کارنامەی خۆمانەوەو واز لە ئیش و کار نەهێنین و پاڵی لێبەینەوە؟ فەرمووی: هەرکەس هاوەڵی کامەرانی بێت لەداهاتووی نزیکدا بەرەو ئەو ڕێیە ئەڕوات و هەرکەس هاوەڵی بەدبەختی بێت لەداهاتووی نزیکدا بەرەو ئەو ڕێیە ئەڕوات، هەروەها فەرمووی: هەموو کەس گونجێنراوە بۆ ئەو شتەی بۆی دروستکراوە، ئەوەی هاوەڵی کامەرانی بێت لەداهاتووی نزیکدا بەرەو ئەو ڕێیە ئەڕوات و ئەوەش هاوەڵی بەدبەختی بێت لەداهاتووی نزیکدا بەرەو ئەو ڕێیە ئەڕوات ، پاشان ئەم ئایەتانەی خوێند: (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى وَأَمَّا

[1] صحيح مسلم، كتاب القدر، باب: كيفية خلق الادمي في بطن امه، ژمارەی حەدیسەکە(٦٩٠١)، هەروەها صحيح البخاري، كتاب القدر، باب: وكان امرالله قدرا مقدورا، حەدیسی ژمارە(١٣٦٢).

مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى)، ئەو کەسەی کە ببەخشێت و خۆی لەگوناه بپارێزێت وبڕوا بەبەهەشت بهێنێت ئەوە ئێمەش ئاسانکاری بۆئەکەین بڕوات بەرەو سانایی و بەختەوەری، بەلاّم هەرکەس پیسکەو رەزیل بێت و بێمنەت بێت و خۆی بەدەوڵەمەند بزانێ و بەهەشت بەدرۆ بزانێ ئەوە ئێمەش ئاسانکاری بۆئەکەین بڕوات بەرەو گرانی و بەدبەختی..یان لە نمونەی ئەو حەدیسەی ئیبن عەبباس کە ئەفەرموێ:( كنت خلف النَّبيِّ - صلى الله عليه وسلم - يوماً ، فَقَالَ : ( يَا غُلامُ ، إنِّي أُعلِّمُكَ كَلِمَاتٍ : احْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ ، احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسأَلِ الله ، وإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ ، وَاعْلَمْ : أنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إلاَّ بِشَيءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ ، وَإِن اجتَمَعُوا عَلَى أنْ يَضُرُّوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إلاَّ بِشَيءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ ، رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ وَجَفَّتِ الصُّحفُ) .

وفي رواية : ( احْفَظِ الله تَجِدْهُ أمَامَكَ، تَعَرَّفْ إِلَى اللهِ في الرَّخَاءِ يَعْرِفكَ في الشِّدَّةِ، وَاعْلَمْ: أنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبكَ، وَمَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَاعْلَمْ : أنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ، وَأَنَّ الفَرَجَ مَعَ الكَرْبِ، وَأَنَّ مَعَ العُسْرِ يُسْراً )[1] .

ئەم جۆرە فەرموودانە وەك کاری ئەو لیژنە پسپۆرانە وایە کەوەزارەتی پەروەردە- بۆنمونە- دروستی ئەکات بۆ ئەوەی هەموو ئەو کەسانەی کە لە قوتابخانەکاندا ئەخوێنن هەڵبسەنگێنن تا لەداهاتوودا سوود لە بەهرەو تواناکانیان وەربگرن[2]، ئەوانیش پاش ئەوەی پێڕەویئەکەن لەوردترین پێوەرە زانستیەکان و

---

[1] جامع الاصول من احاديث الرسول، ابن الاثير، رقم الحديث(٩٣١٥).

[2] هەڵسەنگاندنی خەڵك بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی بەبەردەوامی هەبووە لەرووی چەند پێوەرێکەوە ئەو کارە کراوە: لەرووی زانستی قیافەناسیەوە، یان زانستی حەوت ئەنەرژییەکەوە، یان زانستی ژمارەکانەوە، زانستی پیتی ناوەکانەوە، یان لەرووی زمانی جەستەو حەرەکاتی جەستەوە...سەیرنییە ئەگەر کەسێك سەیری قیافەی یەکێکی

ئەزموونەکانی خۆشیان، هەموو پێشبینی و ئەگەرەکان تۆمارئەکەن بۆ یەکەیەکەی ئەو قوتابیانە لەرووی خشتەیەکی وردو ئالۆزەوە، پاش لێبوونەوە لەکارەکانیان وتەبێژی لیژنەکە لەناو وەزارەتدا رایئەگەیەنێت کە: بەپێ ئەو خشتانەی ئێمە کردوومانە ئەوەندە کەسیان ئەبنە قوتابی کۆلێژی پزیشکی و ئەوەندەیان ئەبنە قوتابی کۆلێژی ئەندازیاری و ئەوەندە بۆ پەیمانگاکان و ئەوەندە بۆ شوانی و ئەوەندە بۆ گاوانی و...... رێگەیان گرتووەتەبەر. جا ئەگەر یەکێك لەو قوتابیانە یان هەرکەسێکی تر بڵێ: کەوایە بۆچی دانەنیشین بەدیار کارنامەی خۆمانەوەو واز لە ئیش و کار نەهێنین و پاڵی لێبەینەوە؟ ئەندامانی ئەو لیژنەیە دەستبەجێ ئەڵێن: پێویست بەوە ناکات، هەموو کەس گونجێنراوە بۆ ئەو شتەی بۆی دروستکراوەو ئەوەی گوڵبچێنێت گوڵ ئەدوورێتەوەو ئەوەی درك بچێنێت درك ئەدوورێتەوەو پەلەپەلی پێناوێ! ئەوەشی ئێمە وتومانە لەسەر بناغەی توانای زیهنی و هەوڵ و ئەزموونی چەند ساڵەو وردترین پێوەری زانستی وتوومانەو چەند ساڵە هەر واش دەرچووە، مەگەرکەسانێك نەبێت کە لەساتێکی گونجاودا ریتمی خۆی گۆڕیبێت و چووبێتەسەر رێگەیەکی تر، ئەگینا فلانە قوتابی دکتۆرییەکەی مسۆگەرەو فلانی

---

کرد دونیایەك پێشبینی بکات بۆ ئەو کەسە: ئەمە سەری ئەسلەع ئەبێت لەداهاتوودا، لەناوەراستی تەمەنیدا لێقەومانێکی گەورە دێت بەسەریدا، ئەگەری تووشبوونی بەفلانە نەخۆشی هەیە، ئەمە لە کۆتایی ژیانیدا خۆی ئەکوژێت....ئەوەش سەیر نیە کەسی وا هەیە ئەگەر ئەو کەسەش نەبینێت و تەنیا ناوەکەی پێبڵێین لەرووی چەند پێوەرێکەوە دەیان پێشبینی بۆ کەسایەتی و ژیانی شەخصی و خانەوادەیی بکات.. ئەگەر ئەمە لەتوانای بەشەردا هەبێت ئەبێ خوا چەند شتی سەیرو سەرسوڕهێنەری لابێت و ئەم بەشەرە سەرسام بکات، وەك پێشبینیکردنی داهاتووی ماددی و مەعنەوی ئەم مرۆڤە بۆ نمونە: خوای پەروەردگار پێویستیەکانی ژیانی ماددی ئەم هەمووە بەشەرە لەئادەمەوە تادونیادونیایە بەم هەسارە بچوکە کە پێی ئەڵێن زەوی دەستەبەرکردووە...بەهەمان شێوە پێویستیەکانی ژیانی مەعنەوی ئەم بەشەرە لە سەردەمی پێغەمبەری ئیسلامەوە تادونیادونیایە بەم کتێبە بچوکە کەناوی قورئانە دەستەبەرکردووە..

تر ئەندازیاریەکەی و ئەوی تر شوانی یان گاوانییەکەی مسۆگەرەو بێمنەت بن چۆن ئەتانەوێ ئەو زانیاریانە بخەنە ژێر تاقیکردنەوەوە..!

یان بۆ نمونە: کەسێکی گەردوونناس یان تیمێکی پسپۆڕ لەرووی ئەزموون و زانستی زۆری خۆیانەوە راپۆرتێك ئەدەنە خەڵکی کە لەفلاَنە کات و لەفلاَنە سەعاتدا خۆر -یان مانگ- ئەگیرێت و لەفلاَنەشوێنەوە باش ئەبینرێت و لەفلاَنە شوێنەوە کەمتر ئەبینرێت، ئەمە عیلمەو هێشتا روونەداوە، ئایا ئەم ئاگاداربوونەی ئەم زانایە یان ئەم تیمە هیچ جۆرە دەخالەتێکی هەیە لەو خۆرگیرانە-یان مانگگیرانە-دا ؟! ئایا مەنتیقی تێدایە خەڵکێك ئەو خۆرگیرانە-یان مانگگیرانە- بکەن بەخەتای ئەو زانایە یان ئەو تیمە گەردووناسەو بڵێن زانیاری و ئاگاداربوونی پێشوەختی ئەوان وایکرد ئەوە روویدات؟!دیارە کەسی بەئاوەز شتی واناڵێت..

ئەم نمونەیەو ئەو نمونەیەی سەرەوەش شتێکی نزیکە لەو مانایانەی ئەم حەدیسەی ئیبن مەسعودو ئەو جۆرە حەدیسانەی تر باسیاننەکەن لەگەڵ چەند جیاوازییەکدا:

١-ئەم پێشبینیکردن و داهاتووخوێندنەوە بۆ مرۆڤ قورس و گرانەو پێویستی بە چەندین پێوەری زانستی و زانیاری جۆربەجۆر هەیە تا دروست دەربچێت، بەلاَم بۆ خوا ئاسانە، وەك ئەفەرموێ:( وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلاَ يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلاَّ فِي كتاب إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللهِ يَسِيرٌ)،فاطر:١١، نەکەسێك هەیە کەتەمەن زۆر بکات و نەکەسێك هەیە کە تەمەن کەم بکات هەموو لەکتێبێکدا نەنووسرابێتەوە، ئەمەش بۆ خوا کارێکی ئاسانە، چونکە خوای پەروەردگار سنوور بۆ زانست و زانیاریەکانی نیە "سبحانەو تعالی"، خۆی ئەفەرموێ:( أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ)،

ئەرێ ئەوەی كە بوونەوەری خولقاندووە باشتر نازانێ ئەو شتانە چین، لەكاتێكدا كە ئەو هەم خاوەنی زانیاری وردەو هەم ئاگادارو شارەزاشە؟! هەروەها ئەفەرموێ:( هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ)... پەروەردگار ئەو خوایەیە كە ئاسمانەكان و زەمینی بەشەش رۆژ دروستكردووە، پاشان چووەتەسەر تەخت، ئەو پەروەردگارە ئەزانێ چی ئەچێت بەناوی زەویداو چی لێدێتەدەرەوە، ئەزانێ چی لەئاسمانەكانەوە دائەبەزێت و چییش سەرئەكەوێ و خۆی ئەكات بەناو ئاسمانەكاندا، ئەو پەروەردگارە بەردەوام لەگەڵتاندایە ئێوە لەهەر شوێنێكدا بن، خواش بینەری هەموو ئەو شتانەیە كە ئێوە ئەیانكەن..[1]

٢-مرۆڤ هەندێ جار یان زۆرجار نایپێكێت و بەدرۆ ئەكەوێتەوە، یان قوتابییەكان دوور لەحساباتی ئەمان ئەكان بەخۆیان ئەدەن و ئالیەتی گونجاو ئەدۆزنەوەو پێچەوانە بە ئەو پێشبینیانە رێئەگرنەبەرو داهاتووی خۆیان ئەگۆڕن، بەلام خوا

---

[1] ئەگەر كۆمپانیایەكی تەلەفۆنی -وەك ئاسیا سێڵ بۆ نمونە- بتوانێت لەیەك ساتدا ئاگای لەنۆ ملیۆن و زیاتر بەشداربووی خۆی هەبێت و سەنتێك یان قسەیەك یان هەوڵێكی تێكدەرانەی بەشداربووەكانی لێ وون نەبێت و بتوانێ لەو چركەساتەدا هەموو پەیوەندیەكان رێكبخات و كەس نەكەوێت بەسەر كەسدا...ئەی بۆچی ئەبێت سەرلەوە بكرێتەوە كەخوای پەروەردگار ئەم هەموو بوونە داخڵ بەسیستەمێكی وا بكات كە لەچركە ساتێكدا پەیوەندی هەموو بەندەكانی رێكبخات و كەسیش لەكەس نەكەوێت و كێی ویست بەردەوامی بكات و كێی ویست پشتیوانی بكات بە بالانس و بە تواناو هێزو رزقی جۆراوجۆرو.. كێشی ویست بالانسەكەی بێنێتەخوارەوە یان كۆتایی پێبهێنێت و لەناو ئەو تۆڕەدا دەریبهێنێت و داخڵ بەتۆڕو سیستەمێكی تری بكات بۆنمونە: لەتۆڕی مادديات دەریبهێنێت و بیخاتەناو تۆڕی رۆح و دونیای رۆح كە پێوەرەكانی ئەو سیستەمە هیچی لەم سیستەمە دونیاییە ناچێت، ئەسزای، ئەپاداشتی، ئەتواناكانی، ئەسنوورەكانی (زەمەلكان)، چونكە لەراستیدا دونیای رۆح نە زەمان و ئەمەكان ناتوانن سنووورداری بكەن، رۆح ئەتوانێ لەدوو زەمانی جیاوازو لەدوو مەكانی جیاوازدا ئامادەبێت لەیەك ساتدا! كەبێگومان ئەمە بۆ مادە دەستنادات..

وانیەو زانایە بەداهاتوو وەك زانایە بەئێستاو ڕابردوو.. ( وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي السَّمَاءِ وَلا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ ) ﴿يونس: ٦١﴾، وننابێت لەپەروەردگارت تۆسقاڵێك شت چییە، نە تۆسقاڵێك شت لە زەویدا بێت یان نەلەئاسمانەکاندا بێت یان نەلەوە بچوکتر یان لەوەش گەورەتر هەبێت و هەمووی لەکتێبێکی ڕووندا تۆمارنەکرابێت.

٣-وەك کەس بۆی نیە بەجێماوی و بەگاوانبوونیی خۆی بخاتە سەر پێشبینیەکانی ئەو لیژنەیە، هەرواش کەس بۆی نیە بەدبەختی و سەرگەردانی خۆی بخاتە سەر خوای پەروەردگار..

٤-ئەو کارانەی ئەو لیژنە ئەیکات کارێکی عەبەس و بێهوودە نیە، چونکە ولات لەژێر ڕۆشنایی ئەو جۆرە توێژینەوە زانستیانەدا نەخشەی خۆی دائەڕێژێت و داهاتووی نەوەکانی دیاریئەکات و کێشەو چارەسەرەکان کۆنترۆڵئەکات، ئەوەش بۆ خوا عەبەس و بێهوودەیی نیە، بەڵکو لەژێر ڕۆشنایی ئەو زانیاریانەدا خوای گەورە نەخشەی تەمەن و ساڵانەو مانگانەو ڕۆژانەی ئەم مرۆڤە دائەنێت وەك هەندێ لەزانایان بەدرێژی ئەم باسانەیان کردووە[1] .

٥-خوا ئەتوانێت لەو قەدەرانە قەزا دروستبکات یان نەیەڵێت قەزایان لێدروست ببێت و گۆڕانیان تێدا بکات ئەگەر مرۆڤەکان خۆیان گۆڕی و دەستکاری ئەو هەلومەرجانەیان کرد کە دەوری داون وەك خوای گەورە پەیمانیداوەو ئەفەرموێ:( إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ)، مرۆڤیش بەهەمان شێوە دەسەڵاتی ئەوەی هەیە ئەو

---

[1] بۆ ئەو نەخشانە سەیری"معارج القبول بشرح سلم الوصول الى علم الاصول"ی حافیز حەکەمی بکە، جەلدی دوو، لاپەرە٢٧١ تا ٢٨٠.

تەقدیرانە قەزایان لێدروستبکات یان بیانگۆڕێت وەك کردنەوەی خوولی بەهێزکردن بۆ قوتابیان، یان ناسانکاریکردن لە تاقیکردنەوەکاندا یان گۆڕینی مەرجی وەرگرتن لە زانکۆو پەیمانگاکاندا..و بەو شێوەیە، لەگەڵ ئەمەدا خوا ئەوەی ویستی بۆی ئەچێتەسەر، بەلاّم مرۆڤ ئەگەر خوا ئیزن نەدات ئەوە چەند هەوڵبدات بێهوودەیە..

**حەوتەم**:من سەرنجێکی تایبەتم لەم فەرموودانە وەرگرتووەو لە خوێنەری بەڕێزی ناشارمەوە ئەویش ئەوەیە: ئەو نزمترین سنوورەی خوا بۆ عەبدی دائەنێت بریتیە لە ئیمانداری نەك کافرێتی، کامەرانی نەك بەدبەختی، رزق و تەمەنێکی دیاریکراو نەك بێڕزقی .. و ئەمەش بۆ هەموو کەسێکەو خوای گەورەش ئەم بڕیارە لە هەقی هیچ کەسێکدا ناگۆڕێت و کەس بە کافری لەسەرەتادا دروست ناکات و بەدبەختی بکات، بەلاّم ئەوە مرۆڤ خۆیەتی دوایی ئەو ئیمانە فیتری و بنچینەییە ئەکوژێنێتەوەو ئەیگۆڕێت بۆ کوفرو بێدینی و شەقاوەت و بەدبەختی..، بەڵگەش بۆ ئەمە بریتییە لە ئایەتی صەریحی قورئان و حەدیسی صەریح و صەحیحی پێغەمبەر (صلی الله علیه والەوسلم).

خوای گەورە ئەفەرموێ:( فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ).تۆ هەر ڕوو لەم دینە بکەو هەر بەرەو هەق هەنگاو بنێ! دینێکی بنەڕەتییەو خوا خەڵکی لەسەر ئەو سروشتە خولقاندووە، کاری خوداش گۆڕانی بەسەردا نایەت، دینی پتەوو پایەدارو راگر هەر ئەمەیە، بەلاّم زۆربەی خەلکی ئەمە نازانن!!

پێغەمبەریش(صلی الله علیه والەوسلم)ئەفەرموێ:( مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ كَمَا تنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيرَةَ رضي الله عنه: (فِطْرَةَ اللهِ

الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللهِ، ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ)[١] . هیچ منالێك نییە بە موسڵمانێتی لەدایك نەبێت، دواتر ئیتر لە لایەن باوك و دایكیەوە یان ئەكرێ بە جوولەكە یان بە گاور یان بە ئاگرپەرست، وەك چۆن ئـاژەڵی لـووت و گـوێ سـاغ بەگوێ و لووتی ساغەوە لەدایكی ئەبێت ئایا ئەبینن لووت و گـوێی بڕاویێـت كـە لەدایك ئەبێت؟ پاشان ئەبوهورەیرە ئەم ئایەتـەی خوێنـدەوە:(فِطْـرَةَ اللهِ الَّتِـي فَطَـرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللهِ، ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ).

لەبەر ئەمە هیچ كەسێك بیانووی ئەوەی نیە كە بڵێ:"لَوْ شَاءَ اللَّـهُ مَاأَشْـرَكْنَا وَلَـا آبَاؤُنَا وَلَاحَرَّمْنَا مِنْ شَيْءٍ"[٢] ، یان بڵێ: قەدەر چی نووسی تێپەڕی تازە! چونكە ئەو بەموسڵمانێتی لەدایكبووەو پەروەردگاریش عەقڵی پێداوەو هەموو ئیمكانـاتێكی خۆپێگەیاندنیشی لەرووە مەعنەوی و مادییەكانەوە بۆدەسـتەبەركردووەو لەسـەرو ئەمانەشەوە پێغەمبەرانیشی بۆ ناردووە هاوڕێ لەگەڵ پەیامە پیرۆزەكـانی خۆیـدا كە پڕن لەبیرۆكەو بەرنامەی خۆپێگەیاندن و خۆكـاملكردن، و بیانوویـانی بڕیـوەو بواری خۆفریودان و خۆدزینەوەیان بۆ نەهێڵاوەتەوە، و ئەبێ پێڕەوی لەو بەرنامانـە بكات كە خوا بەپێغەمبەراندا ناردوویەتی ئەگەر سەربەرزی و سـەرفرازی ئـەوێت، ئەگەر رسوایی و نادروستیشی ئەوێت ئـەوە كـەیفی خۆیـەتی و هـەر خـۆی زەرەر ئەكات و ئەبێ لۆمەی خۆی بكات نـەك خـەڵكی تـر، خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: (وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلًا لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّـهُ مُوسَـى تَكْلِيمًا (١٦٤) رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ

---

[١] البخاري، كتاب الجنائز، بـاب إذا أسلم الصبي فمات هل يصلى عليه، اللؤلؤ و المرجـان فيمـا اتفق عليـه الشيخان.

[٢] ئەگەر خوا بیویستایە ئەوە ئەئێمەو نە باوباپیرانمان شەریكمان بۆ خوا بڕیار نەئەدا!

وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٦٥) لَكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنْزَلَ إِلَيْكَ أَنْزَلَهُ بِعِلْمِهِ
وَالْمَلَائِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا (١٦٦) إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ
قَدْ ضَلُّوا ضَلَالًا بَعِيدًا (١٦٧) إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَظَلَمُوا لَمْ يَكُنِ اللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا
لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا (١٦٨) إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا
(١٦٩) يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمُ الرَّسُولُ بِالْحَقِّ مِنْ رَبِّكُمْ فَآمِنُوا خَيْرًا لَكُمْ وَإِنْ
تَكْفُرُوا فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا (١٧٠)

هیوادارم بەم چەند روونکردنەوەیە توانیبێتم ئەم مەسەلەیەم رۆشنکردبێتەوەو وەلآمی ئەو پرسیارانەم دابێتەوە کە زۆرجار لەم بابەتەدا ئەبنە گرێ و پەرچ لەبەردەم بینینی رۆشندا.

و ان الله لهاد الذين امنوا الى صراط مستقيم

## سەرچاوەكان


١. نظام الإسلام، تقي الدين النبهاني.

٢. الاداب، البيهقي.

٣. المسند، أحمد.

٤. روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني، ئالووسي.

٥. البحر المحيط، ابوحيان الاندلسي.

٦. المنطلق، محمد احمد الراشد.

٧. هكذا ظهر جيل صلاح الدين، ماجد عرسان الكيلان.

٨. شرح الطحاوية في العقيدة السلفية، صدر الدين علي بن علي بن محمد بن أبي العز الحنفي، تحقيق أحمد محمد شاكر.

٩. المفهم لما أشكل من تلخيص كتاب مسلم، أبو العبَّاس أحمَدُ الأنصاريُّ القرطبيُّ.

١٠. موقع شبكة المشكاة الإسلامية .

١١. دليل الفالحين شرح رياض الصالحين، ابن علان الصديقى.

١٢. http://www.yasoob.com.

١٣. فرق وطبقات المعتزلة، القاضي عبدالجبار.

١٤. مفاتيح الغيب، الرازي.

١٥. موقع شبكة المشكاة الإسلامية.

١٦. كتاب الشريعة، الاجري.

١٧. مجموع الفتاوى، ابن تيمية.

١٨. المستدرك، الحاكم.

١٩. الجامع الصغير في أحاديث البشير النذير، جلال الدين عبد الرحمن بن أبي بكر السيوطي.
٢٠. اللؤلؤ والمرجان فيما اتفق عليه الشيخان، محمد فؤاد عبد الباقي.
٢١. الديباج على صحيح مسلم، جلال الدين، السيوطي.
٢٢. إتحاف الخيرة المهرة بزوائد المسانيد العشرة، أحمد بن أبي بكر بن إسماعيل البوصيري.
٢٣. الاذكار النووية، محيي الدين أبي زكريا يحيى بن شرف النووي الدمشقي.
٢٤. پوختەیەك لە كتێبی چۆن لە بنەماكانی ئیسلام تێبگەین؟، ئیكرام كەریم.
٢٥. عەقیدەی مە رضییە، مەولەوی، مەلاعەبدولكەریی مودەریس.
٢٦. سير اعلام النبلاء، الذهبي.
٢٧. المختار من كنوز السنة النبوية، د.محمد عبدالله الدراز.
٢٨. تهذيب التهذيب، العسقلاني، دار الفكر-بيروت، ١٤٠٤هـ -١٩٨٤م
٢٩. العقيدة الطحاوية، التركي، الأرناؤوط، شرح العقيدة الطحاوية.
٣٠. شرح العقيدة الطحاوية، سفر الحوالي.
٣١. منهج الاشاعرة في العقيدة، سفر بن عبدالرحمن الحوالي.
٣٢. جامع لطائف التفسير، عبد الرحمن بن محمد القماش.
٣٣. روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني، محمود الألوسي.
٣٤. القضاء والقدر في القران الكريم، بابا علي الشيخ عمر القرداغي.
٣٥. ئیشكردن یان تەمەڵی، عەبدولعەزیز پارەزانی، ژمارە(٢٥)ی كتێبە بلاوكراوەكانی پرۆژەی تیشك.
٣٦. معارج القبول بشرح سلم الوصول الى علم الاصول، حافظ حكمي.

هەندێ سەرچاوەی تریش كە لەپەراوێزەكاندا ئاماژە كراوە بۆیان.

# ناومرۆك